# پاداشت و سزا

لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ

لەگەڵ هەندێ فەرمودەی لاوازو هەڵبەستراودا



سیروان کاکە أحمد

1436هـ ـ 2014م

# پاداشت و سزا

## لە

## فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ

لەگەڵ

هەندێك فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراودا

نوسینی:

سیروان کاکە أحمد

١٤٣٤ هـ

**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم**

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ ﴾الرعد.

## پێشکەش بێ

بە دایكو بـابم، هاوسـەرم، بـراو خوشـكەكانم، گشـت بـرادەرانم، هـەر كەسـێك كـە دەیخوێنێتەوەو كاری پێ دەكات.

**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمْ**

**وَبِهِ نَستَعِيْن..**

له ژێر ڕۆشـنایی ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەی خـوای بـەرزو بـێ وێنـە کـە لـە قورئانـدا فەرموویەتی:

﴿ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾الحجر.

واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە بە ڕاستی من لێبووردەی میهرەبانم، (بەڵام) بێگومان سزاکەشم (بۆ خراپەکاران) سزایەکی زۆر سەختو بە ئێش‌و ئازارە.

هەڵسام بە دانانی دەرسێك لە مزگەوتی (اللهُ أكْبَر)، بۆ هەندێ برای خۆشەویست[1]، دوای ئەوەی هەستم کرد سوودێکی زۆریان لێ بینیوە، بە باشم زانی ئەم دەرسانە کۆبکەمەوەو بیخەمە سەر کاغەز، بۆ ئەوەی لە دوو توێی کتێبێك چاپ بکرێن‌و بڵاو بکرێنەوە، تاکو ڕێژەیەکی زیاتری مسوڵمانان لێی سوودمەند بن، وە بشتوانرێ لە مزگەوت‌و شوێنە تایبەتیەکان‌و ماڵەکان دەرسی لەسەر بخوێنرێ‌و خەڵکیان لەسەر پەروەردە بکرێ.

دوای ئەم هەوڵە، ئەم کتێبە چاوی بە دنیای چاپ هەڵهێناو ئێستا لە ژێر دەستی تۆی بەڕێز دایە، بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوەو لێی بەهرەمەند بی!

**سیوان کاکە أحمد**

**٦ / ڕەمەزانی/ ١٤٣٤هـ**

**هەولێر**

---

١) ئەم دەرسە دوو برگە بوو، برگەی یەکەم (پاداشت‌و سزا لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا)، برگەی دووەم بە ناونیشانی (فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوا، بتوانم بیڵێم لە شوێنی خۆیدا)، شایانی باسە فەرموودانەکان لە بەر دەکران‌و هەفتانە پرسیارو وەڵامیشمان هەبوو.

# گرنگی باسکردنی پاداشتو سزا له قورئان

له قورئانو سونندتدا بۆ هیدایەتدرانی خەڵك زۆر ئاماژه به پاداشتو سزا کراوه، چونکه مرۆڤ هەمیشه که کارێك دەکات حەز دەکات بزانێ چ پاداشتێکی هەیە؟ وه ئەگەر ئەنجامی نەدات چ سزایەکی هەیە؟ یان به پێچەوانەوه، سەرەنجام به زانینی ئەم پاداشتو سزایه، ئارەزووی ئەنجامدانی کردەوه چاکەکانی زیاد دەبێو، هەوڵی زیاتر دەدات بۆ خۆ دوورگرتن له کردارو گوفتاره خراپەکان.

کاتێ تەماشای قورئان دەکەین، دەبینین خوای پەروەردگار له ناردنی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوو وشەی فەرمووه، که بریتین لە: ﴿مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾، واته: موژدەدەرن به پاداشت، ترسێنەرن به سزا، با سەرنجی چەند ئایەتێك له قورئان بدەین، که موژدەدان به پاداشتو ترساندن به سزایان تێدا باسکراوه، که ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ ئێمەی مسولمانیش له کاتی بانگ کردنی خەڵكو ڕێنمایی کردنیان هەمان شێوازی قورئان پەیڕەو بکەین.

خوای کاربەجێ له سوورەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾، واتە: پێغەمبەرانێکی موژدەدەر (به پاداشت)و ترسێنەر (به سزای بۆ ناردوون) تاکو دوای هاتنی پێغەمبەران خەڵك بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، وه خوا زاڵی کاربەجێیه.

وه هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ .. ﴿٤٨﴾﴾، پێشەوا قورتوبی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: (أي: بالتَّـرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب) یانی: به ئارەزوو دانەبەرو ترساندن، بەڵام حەسەنی بەسرایی ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی: (مُبَشِّرِينَ بسعَةِ الرِّزْقِ فِي الدُّنْيَا وَالثَّوَاب الآخِرَةِ يَـدلُّ

عَلَى ذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٩٦) ﴾الأعراف، وَمَعْنَى مُنْذِرِينَ: مُخَوِّفِيْنَ بِعِقَابِ الله)، واتە: موژدەدەرن بە فراوانـی لـە ڕزقو ڕۆزی لـە دنیاو پاداشت (ی زۆر) لە دواڕۆژ، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرمایشـتی خـوای بـەرزە کـە دەفەرموێ:﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ (٩٦) ﴾.

وە لـە سـوورەتی (غافر)یشـدا فەرموویـەتی: ﴿ غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ (٣) ﴾، یـانی لێبـوردەی گونـاحو تاوانـە خـوای گەورە، وە وەرگری تۆبەو گەڕانەوەی گوناهبارانەو پاداشتیان دەداتەوە، بەڵام سـزاکی زۆر سەختە بۆ گوناهبارانێك کە ناگەڕێنەوە

لەم ئایەتەدا خوا بۆمان ڕووندەکاتەوە کـە لەگـەڵ ئـەوەی خـوا خـاوەنی لێخۆشـبوونە لـە گوناهان بۆ کەسێك تۆبە دەکات، بەڵام خاوەنی سزایەکی زۆر تووندو بە ئێشە بۆ کەسێك کە لە خۆی بایی بیٚو سەرپێچی بکات.

ئەم دوو سیفەتە لە زۆر شوێنی قورئاندا ئاماژەی پێکراوەو هاتوە، بـۆ ئـەوەی بەنـدە لـە نێوان ئومێد بە ڕەحمی خواو ترس لە سزای خوا بمێنێتەوە.

وە لە سوورەتی (البروج)دا خوا وەسفی خۆی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ (١٢) إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ (١٣) وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ (١٤) ﴾، واتە: بێگومـان دەسـت وەشـاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە، وە هەر ئەوە لەسەرەتاوە مـرۆڤ دروسـت دەکـات (وە دوای مردن) زیندووی دەکاتەوە، وە هەر ئەو لێخۆشبووی میهرەبانە.

هـەروەها لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٦٥) ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگارت سـزای زۆر خێرایـە، (بـەڵام لەگـەڵ ئەوەش) زۆر لێبوردەو بەبەزەییشە، سزای خێرایە بۆ کەسێك کە شایستەی سزابیٚو تۆبـە نەکات، وە لێبوردەو بەبەزەییشە بۆ کەسێك کە شایستەی ڕەحمەتو بەزەییو لێبووردنی

خوای پەروەردگارەو زوو زوو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾إبراهيم، واتە: ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن (لە گشت بەهرەکان) بۆتان زیاد دەکەم، بەڵام ئەگەر سپڵەبن، ئەوە سزای من زۆر سەختەو بە ئێشە، وە لە سوورەتی (الرعد)دا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ ﴾... هتد.

ئەگەر لەم ئایەتانە وردبینەوە دەبینین سەرەتا خوا ئومێدێك دەبەخشێ وەك پاداشت بۆ چاکەکاران، دوایی باسی شتێکی ترسێنەری کردوە کە سزای خوایە بۆ خراپەکاران، کە ئەم شێوازە زۆر گرنگی پێدراوە لە قورئان وەك پێشتر باسمان کرد.

جا ئەم قورئانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بۆ لا بانگ دەکات ئەوەندە تەئکید لەسەر ئەم شێوازی بانگەوازە بکاتەوە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەر چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ کە لە کاتی بانگەوازی کردنی خەڵك بۆ ئەم دینە پیرۆزە هەمان شێواز لە فەرمایشتەکانی ڕەچاو بکات، وە ئێمە کە شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری خواین ﷺ، دەبێ هەوڵبدەین لە کاتی بانگەوازی بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمان شێواز ڕەچاو بکەین، بۆ ئەوەی:

مسوڵمانان هەمیشە لە نێوان (الْخَوْف وَالرَّجَاء)دا بژین، بترسن لە هاتنە خوارەوەی سزاو تووڕەیی خودا، وە ئومێدی زۆریشیان هەبێ بە لێبوردەیی‌و بەزەیی خوا.

فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە:

ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای گەنجێك لە کاتی مردندا بوو، پێی فەرموو: {كَيْفَ تَجِدُكَ؟ قَالَ: أَرْجُو اللهَ يَا رَسُولَ اللهِ، وَأَخَافُ ذُنُوبِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لا يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَوْطِنِ، إِلاَّ

**أَعْطَاهُ اللهُ مَا يَرْجُو وَآمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ}**[1] واتـە: حاڵـت چـۆن دەبینـی (یـانی: کـە خەریکە لە دنیا کۆچ دەکەی بۆ دوارۆژ، ئومێدت چەند بە ڕەحمی خوا هەیەو ترست چەند لە سزای خوا هەیە)؟ گوتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئومێـدم بـە ڕەحمـی خـوا هەیـە، سەرەڕای ئەوەی ترسم لە گوناهەکانیشم هەیە، ئەویش فەرمووی: هیچ کاتێـك لـە کـاتی مردندا ئەم شتانە لە دڵی بەندە کۆنابنەوە، مەگەر خوا هـەر ئـەوەی پـێ دەبەخشـێ کـە ئومێدی پێی هەیە، وە دەیپارێزێ لەوەی کە لێی دەترسێ!

١) حَسَنٌ: أخرَجَهُ عَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٣٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٩٨٣)، قَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي الكبرى برقم: (١٠٩٠١)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٦١)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٣٣٠٣)، قَالَ حُسَين سليم أسـد: رِجَالُهُ رِجَال الصَّحِيح، وَالبَيْهَقِي فِي "شُعب الإيمان" برقم: (١٠٠٢)، حَسَّنَهُ الأَلبَانِي.

# پاداشتی گێڕانەوەی فەرموودەی صەحیح

# و

# سزای گێڕانەوەی فەرموودەی هەڵبەستراو



**پاداشت:** {«رَحِمَ اللهُ مَنْ سَمِعَ مِنِّي حَدِيثاً، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ»}[١]
واتە: خوا ڕەحم بەو کەسە بکات کە لە منەوە گوێ بیستی فەرموودەیەك بووە، دوایی ڕایبگەیەنێت بەو شێوەی کە بیستوویەتی.
**سزا:** {«مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»}[٢]
واتە: هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە ناوی منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە نێو ئاگردا دابنێ.

## ڕوونکردنەوە

١)- پێغەمبەری خوا ﷺ دووعای بۆ ئەو مسوڵمانە کردوە، کە سەرگەرمو سەرقاڵی فەرموودەکانیەتی، واتە: دەیانخوێنێو لەبەریان دەکاو کاریان پێدەکاتو خەڵکیان لێ فێر دەکات، وە لەسەر ئەم کارە بەردەوام دەبێ، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەوبارەوە دەڵێ: (مَا كَتَبْتُ حَدِيثاً إلاَّ وَقَدْ عَمِلْتُ بِهِ)[٣] واتە: هیچ فەرموودەیەکم نەنووسیوە مەگەر سەرەتا ئیشم پێکردوە!

دووعای پێغەمبەر بۆ کەسێك فەرموودە لەبەر دەکا
تێدەگاو کاری پێدەکاو ئنجا خەڵکیش فێر دەکا
بەرز بوونەوەی پلەیەو ڕەحمەتەو لێ خۆشبوونە
لە لای ڕەحمان کە خاوەنو پەروەردگاری بوونە.

٢)- خەریك بوونت بە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وات لێدەکات زۆرترین صەڵاوات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بنێری! کە غەیری ئەهلی حەدیس بێ بەشن لەو پلەو پایەو پاداشتە گەورەی لە ئەنجامە صەڵاوات ناردن بۆ خۆشەویستی خوا ﷺ بە دەستی

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّانَ: (٦٨) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، صَحَّحَهُ الألباني.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٩٦٠)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (١٠٨) وَمُسْلِمٌ برقم: (٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٠).
٣) سير أعلام النبلاء للذهبي ج١١، ص٢١٣.

دێنن، بۆ وێنە لە یەکێك لە فەرموودەکان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً وَاحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ، وَحُطَّتْ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئَاتٍ، وَرُفِعَتْ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ»}[1]، واتە: هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوا دە صەڵاواتی لەسەر دەدات، وە دە گوناهی لێ دەسڕدرێتەوە، وە دە پلەش بەرز دەکرێتەوە.

٣)- دەبێ زۆر وریا بین لە بڵاوکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە دووعایەکە بۆ ئەو کەسانەیە کە بە جوانترین شێوە بڵاوی دەکەنەوەو ڕای دەگەیەنن، واتە: چۆنیان بیستوە ئاواش دەیڵێنەوە، وەك فەرمووی: {«فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ»} یانی: کەم نەکاتو زیادیشی نەخات سەر بە ناوی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

٤)- نابێ کەمتەر خەم بین لە بڵاوکردنەوەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە فەرمانی بە بڵاوکردنەوەی کردوەو، فەرموویەتی: {«بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً»}[2]، واتە: لە منەوە ڕایبگەیەننو بڵاوی بکەنەوە ئەگەر یەك ئایەتیش بێ، (یان فەرموودەیەکیش بێ).

٥)- دەبێ زۆر گرنگی بە کردارو گوفتارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بدرێ، چونکە هەرچی فەرموویەتی لە لایەن خواوە پێی گوتراوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤﴾ النجم. واتە: موحەممەد ﷺ لە خۆوە قسان ناکات، بەدڵنیایی ئەوەی دەیڵێ وەحیەو بۆی نێردراوە.

٦)- هەر فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوامان ﷺ پێگەیشت دوای دڵنیابوون لە ڕاستی فەرموودەکە، دەبێ بەپێی توانا جێبەجێی بکەین، بەوەش دەبینە جێبەجێکەری فەرمانی خوای باڵادەست، چونکە خوا عزوجل لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ الرَّسُولُ

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (١٢٩٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "المشكاة" برقم: (٩٢٢)

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٢٦٦٩)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٥٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٥٤٢)، وَالْقُضَاعِيُّ برقم: (٦٦٢)، والديلمي برقم: (٢٠٨١).

﴿فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧﴾ الحشر، واته: ئەوەی پێغەمبەر بۆتان دێنێ وەری بگرنو جێبەجێی بکەن، هەرچیەکیش لێتانی قەدەغە دەکات وازی لێ بێننو خۆتانی لێ بە دووربگرن.

٧)- قسە هەڵبەستان بە ناوی پێغەمبەر ﷺ، واته: هەڵبەستانی قسە بە ناوی خواوە، کە دیارە یەکێکە لە گوناهە گەورەکانو سزاکەی تەنیا ئاگرە، بۆیە کاتێك گوێمان لە فەرموودەیەك دەبێ نابێ یەکسەر بڵاوی بکەینەوە هەتا تەئکید لە (صحیح)ی ئەم فەرموودە نەکەینەوە.

٨)- فەرمایشتی دووەم ئەوەی لێ وەردەگیرێ، درۆکردن بە زاری پێغەمبەر ﷺ، وەك درۆکردن بە زاری خەڵکی دیکە نیە، وەك بۆ خۆی فەرموویەتی: {«إِنَّ كَذِباً عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»}[1]، واته: دڵنیابن درۆ کردن بەسەر زاری من وەك ئەو درۆیە نیە کە بەسەر زاری کەسێکی دیکەوە دەکرێ، وە هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە زاری منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە ناو ئاگر ئامادە بکات.

٩)- جا ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە غەیری حەدیسیش، هەر چیەکی دەبیستین یەکسەر بڵاوی نەکەینەوە، چونکە ڕەنگە ڕاست نەبێو سەرەنجام پێی گوناهبار بین، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوەش فەرموویەتی: {«كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْماً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ»}[2]، واته: ئەوەندە بەسە ئینسان پێی گوناهباربێ، هەرچیەکی بیستو بیگێڕێتەوە!!

١٠)- لە فەرموودەکەی سزا وشەی (متعمداً) هاتوە، واته: مەرجە ئەو کەسەی ئەم سزایە دەیگرێتەوە بە ئەنقەست ئەم فەرموودەی بە ناوی پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام گوتبێ، ئەگەر بە نەزانین بووبێ تا ڕاددەیەك ئاساییە ئەگەر خۆی ماندووکردبێو هەوڵی دابێ بۆ زیاتر شارەزابوونی لە ڕاستیو دروستی فەرموودەکان.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨١٦٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٢٢٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤) .
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: (٤٩٩٤)، وابنُ حِبَّان برقم: (٣٠)، وذكره مُسْلِم في خُطبة صَحِيحه.

**پاداشت:** {«مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً دَخَلَ الْجَنَّةَ»}[١]

واته: هەر کەسێك بمرێ هاوبەش بۆ خوا دانەنێ، دەچێتە بەهەشتەوە.

**سـزا:** {«مَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّار»}[٢]

واته: هەر کەسێك بمرێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، دەچێتە دۆزەخەوە.

## ڕوونکردنەوە

١)- مرۆڤ هەر گوناهێك بکات دەگونجێ خوای بەبەزەیی لێی ببورێ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودە، کە ئەبوو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێ بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ بەندەیەك نیە، بڵێ: {«لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} واته: بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله)، پاشان بمرێ لەسەر ئەو حاڵەتە ئیللا دەچێتە بەهەشت، دەڵێ: منیش سێ جار گوتم: (وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ) واته: ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ فەرمووی: {«وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ»} واته: وە ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟[٣]. ئەمەش بۆ تەئکید کردنەوەیە لەوەی خوا لەو گوناهانە خۆش دەبێ، هەر چەندە گوناهی گەورەن. بەڵام هەرگیز لە کەسێك نابورێ کە هاوبەشی بۆ داناوەو تۆبەی نەکردووەو مردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ... ﴿١١٦﴾ ﴾النساء، واتە: خوا لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ پەیدا بکرێ، بەڵام جگە لەوە لە هەر کەسێکی بوێ (هەر گوناهێکی کردبێ) دەبوورێ (بە پێی ئەو حیکمەتو دادگەریەی هەیەتی).

٢)- گەورەترین چاکە، گوتنی وشەی خوا بەیەکگرتنە، بە پێی ئەم فەرموودە: {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوْصِنِي قَالَ ﷺ: «إِذَا عَمِلْتَ

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٢٣٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥١).

٢) صَحِيحٌ: المصدر نفسه.

٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٨٩)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٣).

سَيِّئَةً، فَأَتْبِعهَا حَسَنَةً تَمْحُهَا، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَمِنَ الْحَسَنَاتِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ؟ قَالَ: هِيَ أَفْضَلُ الْحَسَنَاتِ» }[1] واتە: ئەبوو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی ﷺ: ئەگەر کارێکی خراپت کرد، دوای ئەو کاری چاك بکە، خراپەکەت لێ دەسڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) لە کارە چاکەکان هەژمار دەکرێ؟ فەرمووی: ئەوە باشترینی (کارە) چاکەکانە.

٢)- بەهەشت لەسەر ئەو کەسە حەرامە کە هاوبەشی بۆ خوا داناوە، لەبەر ئەوەی خوای بێ هاوتا بەڵێنی داوەو فەرمووویەتی: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾﴾المائدة، واتە: بە مسۆگەریی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات، وە جێگای حەوانەوەی ئاگر (ی دۆزەخ)ە، وە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

٢)- پاداشتی هاوبەش دانەنانو خوا بەیەکناسین یەکجار زۆر گەورەیە چونکە بەهەشتە، وە خوای گەورە لە هەر کەسێك ڕازی نەبێ نایخاتە بەهەشت، وە ڕەزامەندی خوای بێ هاوتاش لە هەموو شتێك گەورەترە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٧٢﴾﴾التوبة، واتە: ڕەزامەندی لەلایەن خواوە لە هەموو شتێك گەورەترە.

٣)- دوو جۆرە هاوبەش داناغان هەیە، هاوبەش دانانی گەورە هاوبەش دانانی گچکە:

أ/ هاوبەش دانانی گەورە (الشِّرْكُ الأَكْبَر): بریتیە لە دانانی هاوبەشێك بۆ خوا، بپەرسترێ وەك چۆن خوا دەپەرسترێ، خۆشبویسترێ وەك چۆن خوا خۆشدەویسترێ.. مامەڵە لەگەڵ هەر کەسێكو هەر شتێك بکەی وەك ئەو مامەڵەی لەگەڵ خوا دەیکەی شیرکی گەورەیە، بێگومان ئەم جۆرە هاوبەش دانانە خاوەنەکەی لە بازنەی ئایینی ئیسلامو مسوڵمانەتی دەباتە دەر، وە هەرچی کردەوەی باشی هەیبوە هەمووی هەڵدەوەشێتەوەو، ئەگەر تۆبە نەکاتو لەسەر ئەم حاڵە بمرێ ئەوە هەتا هەتایێ لە نێو

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٢١٥٢٥)، تعليق شُعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ لِغَيْرِهِ.

ئاگری دۆزەخ دەمێنێتەوە، وەك پێشتر ئەم ئایەتەمان هێناوە: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾﴾المائدة، واتە: بە مسۆگەریی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات، وە جێگای حەوانەوەی ئاگر (ی دۆزەخ)ە، وە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

## هاوبەش دانانی گەورەو جۆرەکانی

هاوبەش دانانی گەورە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستراوێتی، یان لە بەدیهێنەرایەتی، یان پەروەردگارێتی، یان ناوو سیفەتەکانی دا، چەند وێنەیەك لە هاوبەش دانانی گەورە.

١) پاڕانەوە لە غەیری خوا: بێگومان دووعاو پاڕانەوە یەکێکە لە گەورەترین جۆرەکانی خواپەرستی، بەڵکو ئەوپەڕی خواپەرستی تێدایە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: {«إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ»}[1]، واتە: بە ڕاستی هەر خودی پاڕانەوە خواپەرستییە.

وە هەروەها خوای بەرزیش فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾غافر، مادام سەلمێنرا دووعاو پاڕانەوە خواپەرستیە، کەواتە: ئەگەر لە غەیری خوا بپاڕێیەوە ئەوە هاوبەشت بۆ خوا داناوە، بۆیە دروست نیەو حەرامە داوا لەمردوویەك، پێغەمبەرێك، پیاو چاکێك، گۆڕێك، دارێك، بەردێك بکەی یارمەتیت بداو بە هانەتەوە بێ، یان داوا لە کەسێك بکەی شتێکت بۆ بکات لە کاتێکدا لەوێ نیەو ناتوانێ وەڵامت

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤١٥) ، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم (٢٩١٦٧)، وَالْبُخَارِي فِي "الأدب المُفْرَد" برقم: (٧١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٦٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي "الكُبرى" برقم: (١١٤٦٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٩٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨٠٢) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِيُّ فِي "شُعَب الإيمان" برقم: (١١٠٥)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الصغير" برقم: (١٠٤١).

بداتەوە، ئەگەر لەوێش بێ نابێ داوای لێ بکەی لە شتێك کە بە دروستکراوەکانی خوا ناکرێ، بۆیە هەرگیز نابێ داواو پاڕانەوە بەم شێوەیەو لەو کەس و شتانە بکرێ، وە خواش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾المؤمنون،

٢) (**شرك النية والإرادة والقصد**) هاوبەش دانان لە ویستو مەبەست، بریتیە لە ویستنی شتێك بۆ دەستکەوتنی ماڵێکی دنیایی، یان ناوبانگێکی دنیا، کە ئەم جۆرە هاوبەش دانانە زیاتر لە مونافیقو دووڕووەکان بەدی دەکرێ، لە زۆربەی کردارو گوفتارەکانیان مەبەستیان غەیری خوای باڵادەستە، کە بێگومان ئەمە جۆرێکە لە شیرکی گەورە، خوای گەورەش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾هود، وە ئەم جۆرە هاوبەش دانانە زۆر وردە، وە ترسناکیەکەی زۆر زیاترە لە جۆرەکانی دی!

٣) (**شرك الطاعة**): هاوبەش دانان لە گوێڕایەڵی کردندا، هەر کەسێك گوێڕایەڵی دروست کراوەکانی خوا بکات، گوێڕایەڵی کردنی ئەو کەسانەی کە حەڵاڵەکانی خوا حەرام دەکەن، یان حەرامەکانی حەڵاڵ دەکەن، بێگومان ئەو ئەم کەسە هاوبەشی بۆ خوا داناوە، ئەگەر بێتو بزانێ ئەوە پێچەوانەی فەرمانی خوایە، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، لە یەکێکیاندا فەرموویەتی: {«**لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ**»}[1]، واتە: گوێڕایەڵی دروستکراوەکان ناکرێ بە سەرپێچی کردنی دروستکار، واتە: (خوای پەروەردگار)، بەبەڵگەی ئەوەی خوای بەرز دەربارەی جولەکەو نەصرانییەکان فەرموویەتی:

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٦٧٢)، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلى شَرْطِ الشَّيْخين. وَالحَاكِمُ برقم: (٥٨٧٠) وَقَالَ: صَحِيح الإسْنَاد، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (٣٨١).

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١ ﴾ (التوبة)

**کەواتە: گوێڕایەڵی زانایانو کاربەدەستان ناکرێ لە شتێك کە سەرپێچی کردنی دینی خوای تێدابێ.**

**جا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی تەفسیری ئەم ئایەتەی کردوە وەك (عَدِيٌّ بْنِ حَاتِم) بۆی گێراوینەوە دەڵێ: {أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ:** ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، **قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، قَالَ: «أَجَلْ وَلَكِنْ يُحِلُّونَ لَهُمْ مَا حَرَّمَ اللهُ فَيَسْتَحِلُّونَهُ وَيُحَرِّمُونَ عَلَيْهِمْ مَا أَحَلَّ اللهُ فَيُحَرِّمُونَهُ فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ لَهُمْ»}[1]، واتە: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ خاچێکی زێڕم لە مل دابوو، دەڵێ: گوێم لێ بوو دەیفەرموو:** ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ **منیش گوتم: خۆ ئەوان نایانپەرستن، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووم: با، بەڵام ئەوەی خوا حەرامی کردوەو بۆیان حەڵاڵ دەکەن، وە ئەوەی خوا حەرامی کردوە بۆیان حەڵاڵ دەکەن، ئا ئەوە پەرستنیانە بۆیان!**

**٤) (شرك المحبة) هاوبەش دانان لە خۆشویستن، بریتیە لەو خۆشەویستیەی کە وەك پەرستن وایە، لەبەر ئەوەی زۆر بە گەورەگرتنو ملکەچ بوونو ڕێزگرتنو خۆ بە کەمگرتن بەرانبەر ئەو کەسێك، یان شتێك، کە ئەو شتانە تایبەتن بە خوای پەروەردگار بۆ غەیری وی ناگونجێن، تەنانەت جاری وایە ئەم خۆشویستنە لە خوای بێ هاوتا زیاترە،** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِ ١٦٥ ﴾، **واتە: وە لە خەڵکی هەن کەسانێك کە چەند هاوتایەك پەیدادەکەن بۆ خۆیان لە جیاتی خوا،**

---

١) حسن: أخرجه الترمذيُّ برقم: (٣٠٩٥)، والبيهقيُّ في "الكبرى" برقم: (٢٠١٣٧)، قَالَ الألباني: حَسَنٌ.

خۆشیان دەوێن وەك خۆشویستراني خـوا، واتـە: وەك خـوا سـبحانه وتعـالى مامەڵـەیان لەگەڵ دا دەکەن، وەك چۆن خوا دەبێ لە هەموو کەس پتر خۆشبوویستری‌و بـە گـەورەتر بگیری‌و زیاتر ملی بۆ کەچ بکـری‌و پشـتی پـێ ببەسـتری‌و تـرس‌و سـام و رێـزو شـەرمی بەرانبەر بنـوێنرێ، ئـەوانیش بـەو شـێوەیە مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو پەرسـتراوانەی خۆیانـدا دەکەن.

لە عـەبدوڵلای کوڕی مـەسعوودەوە ڕەزای خوای لێ بێ، گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری کردوە لە پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: {**قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ أَيُّ ذَنبٍ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِداً وَهُوَ خَلَقَكَ»**}[1]، واتـە: گـوتم، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ چ گوناهێـك لـە هەموو گوناهان گەورەترە؟ فـەرمووی: ئـەوە کـە هاوتـاو هاوبـەش بـۆ خـوا دابنێـی، لـە حاڵێکدا کە هەر ئەو تۆی دروستکردوە.

وە لەوبارەوە کە مسوڵمانان دەبێ خواو پێغەمبەری خوایـان لـە هـەموو کـەس‌و هـەموو شتێك خۆشتربوێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: {**«ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لايُحِبُّهُ إلاَّ للهِ، وأنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِكَمَا يَكْرَهُ أنْ يُقْذَفَ فِي النَّار»**}[2]، واتە: سێ شت لە هەر کەسێکدا هەبن ئەوە شیرینی ئیمانی بە هـۆی ئـەو سـێ شـتانەوە چێشتوە، کـە خـواو پێغەمبـەری خـوای لـە غـەیری خۆیـان خۆشـتربوێ، (هـیچ شـتێکی هێندەی خوا، پاشان پێغەمبەر ﷺ خۆشنەوێ)، وە کە کەسێکی خۆشویست تەنیا لەبـەر خوا خۆشی بوێ، وە پێی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر، دوای ئەوەی خوا دەربازی کردوە لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگر.

---

١) صَحِيحٌ: أَخرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٤٢٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٧٧)، وَمُسْلِم برقم: (٨٦)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٣١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٨٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٢٤).

٢) صَحِيحٌ: أَخرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٤٣١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٦)، وَمُسْلِم بـرقم: (١٦٤)، وَالتِّرمِـذِيَّ برقم: (٢٦٢٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٩٨٨)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٣٢٧٩)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي "شُعب الإيمان" بـرقم: (١٦٢٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٣٧).

## هاوبەش دانانی گچکەو جۆرەکانی

هاوبەش دانانی گچکە بریتیە لە ئەنجامدانی هەر کردارو گوتنی هەر گوفتارێك کە هۆکارن بۆ تووش بوون بە هاوبەش دانانی گەورە، وەك: ڕیابازیی، یان بەکارهێنانی هەندێك وشەو تەعبیر کە جۆرێك لە یەکسان کردنی خوای بەرزو مەزنی تێدایە لەگەڵ غەیری خوادا، وەك: سوێند خواردن بە غەیری خوا، وە گوتنی: (**ماشاءَالله وَشِئْتَ**)، (**لَولا الله وَفُلان**)، ئنجا بە گشتی هاوبەش دانانی گچکە دوو جۆرە:

**یەکەم:** بریتیە لە لە هەندێ قسەو هەڵسوکەوت کە لە سەر زمانو ئەندامەکان دەردەکەون، وە بۆنی ئەوەیان لێ دێ کە غەیری خوا وەك خوا تەماشا بکرێ، با سەرنجی چەند فەرمودەیەك بدەین لەم بارەوە:

أ/ تەعبیرێك کە هەست بە هاوبەش دانانی تێدا بکرێ: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَحَدَّثَهُ بِبَعْضِ الْكَلَامِ، فَقَالَ: مَا شَاءَ اللهُ وَشِئْتَ، فَقَالَ: «أَجَعَلْتَنِي لِلَّهِ عِدْلاً، بَلْ مَا شَاءَ اللهُ}**[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەندێ قسەی بۆ کرد، پاشان گوتی: مەگەر خوا بیەوێ‌و تۆ بتەوێ، فەرمووی: ئایا منت کردە هاوتای خوا؟! بەڵێ: مەگەر خوا بیەوێ بە تەنیا.

ب/ سوێند خواردن بە غەیری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أَشْرَكَ**»}[2]، واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە کوفری کردوە، یاخود شیرکی کردوە، واتە: کوفرو شیرکی گچکە.

(بەڵام بە مەرجێك نیەتەکەی وانەبێ، واتە: ئەو شتەی پێ وەك خوا نەبێ، یان پێی لە خوا گەورەتر نەبێ، چونکە دەڵێن: هەبووە گوتوویانە، سوێند بە خوا بخۆ، یەکسەر

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شيبة برقم: (٢٧٢٢٧)، وَالْبُخَارِيُّ فِي "الأدب المفرد" برقم: (٧٨٣)، عَنْ عَبْد الله بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٠٧٢)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (١٥٣٥) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ بـرقم: (٤٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٥١)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٥٩٦٧)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٥٨) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

سوێندی خواردوه، سوێند به قورئان بخۆ یه‌كسه‌ر سوێندی خواردوه، گوتوویانه: سوێند به‌سه‌ری شێخ بخۆ، گوتوویه‌تی: چۆن ده‌بێ؟! مانای سه‌ری شێخی پێ له خواو له قورئان گه‌وره‌تر بووه!! ئه‌وه شیركی گه‌وره‌یه، یاخود هه‌یه كه‌سێكی زۆر خۆشده‌وێ ده‌ڵێ: سوێند به‌سه‌ری فلان كه‌سی ناخۆم، به درۆ، به‌ڵام سوێند به خوا ده‌خوات به درۆ، مانای وایه ئه‌وی پێ له خوا گه‌وره‌تره، ئه‌وه شیركی گه‌وره‌یه، ده‌نا له ئه‌سڵدا سوێند به غه‌یری خوا خواردن شیركی گچكه‌یه.

ج/ ده‌رباره‌ی ئه‌و ره‌فتارانه‌ی كه به هاوبه‌ش دانانی گچكه داده‌نرێ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: {«مَنْ تَعَلَّقَ شَيْئاً وُكِلَ إِلَيْهِ»}[1]، واته: هه‌ر كه‌سێك شتێك هه‌ڵبواسێ حه‌واڵه‌ی ئه‌و شته ده‌كرێ، كه دیاره ئه‌وه جۆرێكه له شیرك.

كه‌سی وا هه‌یه ناڵه‌ی كه‌ر هه‌ڵده‌واسی، بۆ ئه‌وه‌ی له چاوو زاری خه‌ڵك به دووربێ، یان نشته‌كو شت هه‌ڵده‌واسێ به ده‌ستیه‌وه، ئه‌وانه هه‌مووی خورافاتو ئه‌فسانه‌ن، ئه‌وه‌ش جۆرێكه له شیرك، وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له فه‌رمووده‌یه‌كی دیكه‌دا فه‌رموویه‌تی: {«إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ»}[2]، واته: دووعاو نوشته‌یه‌ك كه شه‌رعیی نه‌بێو له قورئانو سوننه‌ت وه‌رنه‌گیرابێ، وه‌ك ئه‌وه‌ی كه جادووگه‌رو نوشته‌چیه‌كان ده‌یكه‌نو ده‌ینووسنه‌وه‌و ئه‌وه‌ی كه هه‌ڵبواسرێ، وه (تِوَلَة) ئه‌وه‌یه كه ژن له لای مێرد خۆشه‌ویست بكرێ، وه مێرد له لای ژن خۆشه‌ویست بكرێ، یاخود ئافره‌تێك له لای پیاوێك، یان پیاوێك له لای ئافره‌تێك خۆشه‌ویست بكه‌ن، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌وانه‌ی هه‌موو به شیرك داناوه، بۆچی؟ چونكه به زۆری ئه‌وانه كه ده‌كرێن به هاوكاریو پشت به‌ستن به شه‌یتانه‌كانه، ناوی شه‌یتانی تێدا ده‌نووسرێ، یاخود هه‌ندێ ژماره‌و ره‌مزو هێمای تێدا ده‌نووسرێ، كه دیاره مه‌به‌ستی ناشه‌رعییو خراپیان گرتۆته خۆیان.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٨٠٣) تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، والترمذي برقم: (٢٠٧٢) وَقَالَ الألباني: حَدِيثٌ حَسَنٌ.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦١٥)، وأبو داود برقم: (٣٨٨٣)، وابن ماجة برقم: (٣٥٣٠)، والحاكم برقم: (٨٢٩٠)، وَقَالَ: صَحِيح الإسْنَادِ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين.

د/ گریانو هاوار کردن بۆ مردووانو تانەدان لە ڕەچەڵەکی خەلکی کردەوەی کافرانە، {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ»}[(١)]. واتە: دوو ڕەفتار خەڵك بەهۆیانەوە تووشی کوفر دەبن: تانەدان لە ڕەچەڵەكو شین گێڕان لەسەر مردوو.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ هەر کەسێك ئەم کردەوانەی کرد کافربێ، بەڵام کردەوەکە لە ئەسڵدا هی کافرانەو ئەو مسوڵمانەی ئەم کردەوانە بکات گوناهێکی زۆر گەورەی کردوە.

**دووەم**: ڕیابازیی (الرياء): جۆری دووەمی شیرکی بچووك: بریتیە لە ڕیابازی، لەو بارەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾الكهف، واتە: هەر کەسێك بە ئومێدی دیداریی پەروەردگاریەتی با کردەوەی باش بکاتو، لە پەرستنی پەروەردگاریدا هیچ کەس نەکاتە هاوبەش، (واتە: کردەوەیەکی چاك کە بۆ خوا دەیکات، با بەشی کەسی تێنەخات، ئەوە ڕیایە).

دەربارەی ئەوەش کە ڕیابازی جۆرێکە لە هاوبەش دانانی گچکە ئەم فەرمایشتە هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {«إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ الشِّرْكُ الأَصْغَرُ»! قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الشِّرْكُ الأَصْغَرُ؟! قَالَ: «الرِّيَاءُ»}[(٢)]، واتە: شتێك کە زۆر مەترسیم لێی هەیە بەرانبەرتان شیرکی بچووکە، (هاوەڵانی بەڕێز) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! شیرکی گچکە چییە؟ فەرمووی: ڕیابازی، ئەوەیە شتێك بکەی بەشی غەیری خوای تێبخەی[(٣)].

---

١) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أحمد برقم: (١٠٤٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٧).

٢) صحيحٌ: أخرجه أحمد برقم: (٢٣٦٨٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسْنَادُهُ صحيحٌ. وأَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الكبير" برقم: (٤٣٠١)، وَقَالَ الهيثميُّ: رِجَالُهُ رِجالُ الصَّحيح.

٣) بۆ وێنە: کەسێکی نوێژکەر کە نوێژ دەکات دوایی دەبینێ خەڵك وا تەماشای دەکەن، ڕکووعەکەی درێژتر دەکاتەوە، یان قورئانەکەی چاکتر دەخوێنێ، یان خشووعەکەی زیاتر دەکات بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵك، ئەوە بای ئەوەندە کە سەرنجی خەلکی پێ ڕادەکێشێ بەو عیبادەتە تووشی ڕیا بووە.

وە هەروەها خوای پەروەردگار لەم فەرمایشتە قودسیەدا دەربارەی شیركی ڕیا فەرموویەتی: {«**أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِيْ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيْهِ غَيْرِيْ، فَأَنَا مِنْهُ بَرِيْءٌ**»}[1]، واتە: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم، لە هاوبەشێتی دا، هەر كەسێك كردەوەیەك بكات بەشی غەیری منی تێبخات ئەوە من بەریم لەو، بەشەكەی خۆشم دەدەم بەو!

## جیاوازی نێوان هاوبەش دانانی گەورەو هاوبەش دانانی گچكە

ا)- شیركی گەورە خاوەنەكەی نابوردرێ مەگەر تەوبە بكات، بەڵام شیركی گچكە بە پێی ویستی دادگەرانەی خوایە، دەگونجێ ببوردرێ، یان نەبوردرێ بێ ئەوەی تەوبە بكات.

٢)- شیركی گەورە هەموو كردەوە باشەكان هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام شیركی گچكە هەموو كردەوەكان باشەكان هەڵناوەشێنێتەوە، تەنیا ئەو كردەوە هەڵدەوەشێنێتەوە كە شیركەكەی تێدا كراوە.

٣)- هەر كەس شیركی گەورە بكات لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر، بەڵام خاوەنی شیركی گچكە لە بازنەی ئیسلام ناچێتە دەر.

٤)- خاوەنی شیركی گەورە بە هەمیشەیی لە دۆزەخ دەمێنێتەوەو، بەهەشتیشی لەسەر حەرامە، بەڵام گوناهی شیركی گچكە، وەك گوناهەكانی دی خاوەنەكەی بە هەمیشەیی لە دۆزەخ نامێنێتەوەو بەهەشتی لەسەر حەرام نابێ.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٢٩٨٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه.

**پاداشت:** {«رِضَا اَللهِ فِي رِضَا اَلْوَالِدَيْنِ»}[1].

واتە: ڕەزامەندی خوا لە ڕەزامەندی دایكو باب دایە (واتە: ئەگەر دایكو باوكێكی مسوڵمانی دیندار لە منداڵەكەیان ڕازی بوون خواش لێی ڕازی دەبێ).

**سزا:** {«ثَلاثَةٌ لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَمُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى»}[2].

واتە: سێ (جۆرە كەس هەن) خوا تەماشایان ناكات لە ڕۆژی قیامەت: ئەوەی ئەزیەتی دایكو بابی داوە، ئەوەی بەردەوام بووە لەسەر خواردنەوەی شەراب (تا مردن)، ئەوەی خێرێك دەكاتو دوایی منەت لەسەر ئەو كەسە دەكات كە خێری پێكردوە.

## ڕوونكردنەوە

١)- خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئان ئاماژەی بە مافی دایكو باب كردوە، بەڵام ئێمە تەنیا دوو ئایەت بە وێنە دێنینەوە، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾الإسراء.

واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە كە شتێك نەپەرستن جگە لەو، وە لەگەڵ دایكو بابتان چاكە بكەن، ئەگەر یەكێكیان (واتە: بابت یان دایكت) یان هەردووكیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ، تەنانەت (مەڵێ) (ئۆف)یش! وە تێیان مەخوڕەو پێیان هەڵمەشاخێ، (بەڵكو) قسەی نەرمو بەڕێزیان لەگەڵ بەكاربهێنە. وە باڵی خۆ

---

١) حسنٌ: أخرجهُ الترمذيُّ برقم: (١٩٠٠)، عنْ عبْد الله بْنِ عُمَرَ ﷺ، وصحّحهُ ابْنُ حبَّان والحاكمُ، وصحَّحهُ الألباني في "الصحيحة" برقم: (٥١٦).

٢) صحيحٌ: أخرجهُ ابْنُ حبَّان برقم: (٧٣٤٠). قال شُعيب الأرنؤوط: إسْنادُهُ صحيحٌ.

به‌كه‌م زانینیان بۆ ڕاڃه له‌به‌ر به‌زه‌یی‌و میهره‌بانیت پێیان، بڵێ: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم ڕه‌حمییان پێ بكه، وه‌ك چۆن ئه‌وان منیان په‌روه‌رده كرد به‌ بچووكی‌و منداڵی.

٢)- دوای ئه‌نجامدانی نوێژ كه‌ هه‌قی خوایه، گه‌وره‌ترین كرده‌وه كه مسوڵمان پاداشتی زۆر له‌سه‌ر وه‌ربگرێ‌و خۆشه‌ویست بێ له‌ لای خوا چاكه كردنه له‌گه‌ڵ دایك‌و بابی، به‌ به‌ڵگه‌ی ئه‌م فه‌رمووده‌یه: { **عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُوْلَ اللهِ ﷺ أَيُّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: «الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ»** }[1]،

واته: عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعوود خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پرسیارم له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كرد: چ كرده‌وه‌یه‌ك له‌ هه‌موو كرده‌وه‌كان خۆشه‌ویستره له‌ لای خوا؟ فه‌رمووی: نوێژ له‌ كاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئه‌و؟ فه‌رمووی: چاكه له‌گه‌ڵ دایك‌و باب، گوتم: دوای ئه‌و؟ فه‌رمووی: تێكۆشان له‌ پێناوی خوادا!

٣)- هاوه‌ڵان باش له‌ مانای مافی دایك‌و باب تێگه‌یشتبوون، بۆیه‌ ته‌ڵحه‌ی كوڕی موعاویه‌ی ئه‌سله‌می خوا لێی ڕازی بێ ده‌ڵێ: چووم بۆ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ، گوتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا! من ده‌مه‌وێ له‌گه‌ڵ تۆدا بێمه‌ جیهاد، بۆ ئه‌وه‌ی ڕه‌زامه‌ندی خوا به‌ده‌ست بێنم، فه‌رمووی: ئایا دایكت زیندووه؟ گوتم: به‌ڵێ، فه‌رمووی: بڕۆ خزمه‌تی بكه‌و ده‌ستی پێوه بگره، (منیش) گوتم: (وا دیاره) پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ، تێمنه‌گه‌یشتوه، بۆیه‌ چه‌ند جارێك دووباره‌م كرده‌وه، فه‌رمووی: { **«اِلْزَمْ رِجْلَيْهَا فَثَمَّ الْجَنَّةُ»** }[2]، واته: بڕۆ ده‌ست به‌ پێیه‌كانیه‌وه بگره‌و (خزمه‌تی بكه)، به‌هه‌شتت بۆ هه‌یه.

٤)- هه‌ر كه‌س بیه‌وێ به‌ ده‌رگای نێوه‌ڕاستی به‌هه‌شت بچێته نێو به‌هه‌شت، ده‌بێ

---

١) صحيح: أخرجه البخاري برقم: (٥٦٢٥)، ومسلم: (٢٦٤) واللفظ له.

٢) صحيح: أخرجه ابن أبي شيبة برقم: (٢٥٩٢٠)، وابن ماجه برقم: (١٨٩٩)، وصححه الألباني.

ڕەزامەندی دایكو بابی لە دنیا بە دەست هێنابێ، چونكە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: {**«الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَحَافِظْ إِنْ شِئْتَ أَوْ ضَيِّعْ»**}[1] واتە: دایكو باب دەرگای نێوەڕاستی بەهەشتن، ئەگەر دەتەوێ بیپارێزەو دەستی پێوە بگرە، یان لە دەست خۆتی بدەو زایەی بكە!

٥)- چاكەكردن لەگەڵ دایكو باب سەرەڕای ئەوەی واجبێكی شەرعییەو هیچ منەتێكی تێدانیە، بەڵام فەزڵێكە خوا بەڵێنی داوە هەر كەس لەگەڵ دایكو بابی باشبێ تەمەنی درێژ بكرێو رزقو ڕۆزیشی بۆ زیاد بكرێ، وەك لەم فەرموودەدا هاتوە: {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمْرِهِ وَيُزَادَ لَهُ فِي رِزْقِهِ فَلْيَبَرَّ وَالِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»**}[2]، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: هەر كەسێك حەز دەكات تەمەنی درێژ بكرێتەوەو رزقو ڕۆزی بۆ فراوان بێ، ئەوە با چاكەكاربێ لەگەڵ دایكو بابی، وە پەیوەندی خزمایەتیش بەجێبهێنێ.

٦)- گەورەترین هەڕەشەی تاوانی خراپ بوون لەگەڵ دایكو باب ئەم دووعایەی جبریلو ئەو ئامینەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر مینبەر كەوت، سێ جاران فەرمووی: ئامین، ئامین، ئامین، كە هاتە خوار لەسەر مینبەر هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی سێ جار فەرمووت: ئامین؟ فەرمووی: جبریل هاتە لام و گوتی: {**«مَنْ أَدْرَكَ شَهْرَ رَمَضَانَ فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ فَدَخَلَ النَّارَ فَأَبْعَدَهُ اللهُ، قُلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، وَمَنْ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ، أَوْ أَحَدَهُمَا فَلَمْ يَبَرَّهُمَا، فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ فَأَبْعَدَهُ اللهُ، قُلْ: آمِينَ، فَقُلْتُ..»**}[3]، واتە: هەر كەسێك بگاتە مانگی ڕەمەزانو (كردەوەیەكی وا نەكات) خوا لێی خۆشبێ، بچێتە ئاگر، نەفرینی خوای لێ بێ، بڵێ: ئامین، منیش گوتم: ئامین، وە هەر كەسێك بە دایكو بابی، یان بە یەكێكیان ڕابگات

---

١) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ التِّرمذِيُّ برقم: (١٩٠٠)، وقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٢) حَسَنٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمد برقم: (١٣٨٣٨)، وَحَسَّنَهُ الألباني، وقال شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

٣) حَسَنٌ: أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٩٠٧) قَالَ شُعَيب الأرنؤوط: إسنادُهُ حَسَنٌ، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: أَبُو يَعْلَى برقم: (٥٩٢٢) قَالَ حُسين سليم أسد: إسْنَادُهُ حَسَنٌ.

(بتوانێ چاکەیان لەگەڵ بکات) چاکەیان لەگەڵ نەکات بچێتە ئاگر، نەفرینی خوای لێ بێ، بڵێ: ئامین، منیش گوتم: ئامین..[١]

٧)- دوو گوناهی تایبەتمەند هەن، خوا پەلە دەکات لەسەر سزادانی خاوەنەکانیان لە دنیادا، پێش ڕۆژی دوایی، یەکێکیان (طغیـان)ە، واتە: دەستدرێژیی و ستەم کردن و سنووربەزاندن، دووەمیان ئازاردانی دایك و بابە، وەك پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: { «**بَابَانِ مُعَجَّلانِ عُقُوبَتُهُمَا فِي الدُّنْيَا البَغْيُ وَالعُقُوقُ**» }[٢]!

٨)- ئەی گەنج! جا کوڕی یان کچ؟! زۆر وریابە لە مامەڵە کردنت لەگەڵ دایك و بابت، چونکە هەر چەندە دینداریی، هەر چەندە خواپەرستیت زۆربێ، هەر چەند نوێژ و ڕۆژوو تەنانەت حەجیشت کردبێ، کە ئازاری دایك و بابت دا هیچ کردەوەیەکت لێ قبووڵ ناکرێ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودە: {**عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ الْجُهَنِيِّ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! شَهِدْتُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّكَ رَسُولُ اللهِ، وَصَلَّيْتُ الْخَمْسَ، وَأَدَّيْتُ زَكَاةَ مَالِي، وَصُمْتُ شَهْرَ رَمَضَانَ، فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ مَنْ مَاتَ عَلَى هَذَا كَانَ مَعَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ هَكَذَا وَنَصَبَ إِصْبَعَيْهِ مَا لَمْ يَعُقَّ وَالِدَيْهِ**}[٣].

واتە: عەمری کوڕی موڕەی جوهەنیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! شایەدیم داوە کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا، وە تۆش نێردراوی خوای، پێنج نوێژە فەرزەکانم ئەنجام داوە و زەکاتی ماڵیشم داوە و مانگی ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بووم، (چی دەڵێ: دەربارەی کەسێك کە ئاوای کردبێ)،

---

١) وە فەرمووی: هەر کەس ناوی تۆ (واتە: پێغەمبەر)ی لەلا بهێنرێ و صەڵاوات نەنێری نەفرینی خوای لێ بێ، فەرمووی: ئامین.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٧٣٥٠) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَادِ وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً البُخَارِيُّ فِي "الأدب المفرد" برقم: (٨٩٤) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي فِي "الصحيحة" برقم: (١١٢٠).

٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي "شُعَب الإِيمَان" برقم: (٣٦١٧)، وَالبُخَارِيُّ فِي "التاريخ الكبير" ج٦. ص٣٠٨"، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٢١٢)، قَالَ الهَيْثَمِيُّ: رَوَاهُ أَحْمَد وَالطَّبَرَانِيُّ بِإِسْنَادَيْنِ، وَرِجَال أَحَد إِسْنَادَي الطَّبَرَانِيُّ رِجَالُهُ رِجَال الصَّحِيح، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي "الترغيب والترهيب" برقم: (٢٥١٥).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك لەسەر ئەم حاڵەتە بمرێ لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدان دایە، وە ئاماژەی بە پەنجەکانی کردوو هێنایەنە لای یەکدی، دوایی فەرمووی: مادام دایكو بابی ئازار نەدابێ! مەفهووم مخالفەکەی ئەوەیە ئەگەر ئازاری دابن ئەوانە هیچ دەورێك نابینن!

٩)- لە زۆر شوێنی قورئاندا خوای بێ هاوتا دوای ئەوەی داوامان لێ دەکات هاوبەشی بۆ دانەنێین، پاشان ڕاستەو خۆ فەرمانمان پێدەکات لەگەڵ دایكو بابمان باش بین، وەك لەم ئایەتانە دەردەکەوێ: ﴿لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴿٨٣﴾﴾البقرة، هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴿٣٦﴾﴾، وە لە سوورەتی (الإسراء) دا دەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴿٢٣﴾﴾.

وە بێگومان خراپ بوون لەگەڵ دایكو باب یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتی صەحیح دا ئاماژەی پێداوە، ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیار کرا دەربارەی گوناهە گەورەکان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: { «**الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ**» }[1] واتە: هاوبەش بۆ خوادانانو کوشتنی کەسێك (بە بێ هۆکار)، وە ئازاردانو خراپ بوون لەگەڵ دایكو باب.

١٠)- دەربارەی سزای کەسێك کە لەگەڵ دایكو بابی خراپە، ئەوەندە بەسە کە لە ڕۆژی دوایی هەموو کەس چاوەڕێی یەك ڕەحمی خوایە، خوا تەماشا ئەو کەسە ناکات کە لەگەڵ دایكو بابی خراپ بووە لە دنیادا!!

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٣٥٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٣٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٠٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠١٠).

# پاداشتی نوێژ کردن

# و

# سزای نوێژ نەکردن

**پاداشت:** {«**إِذَا تَطَهَّرَ الرَّجُلُ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ يَرْعَى الصَّلاَةَ: كَتَبَ لَهُ كَاتِبَاهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الْمَسْجِدِ عَشْرَ حَسَنَاتٍ**»}[1]
واته: ئەگەر پیاو خۆی پاككردەوه (واته: دەستنوێژی هەڵگرت)، پاشان هات بۆ مزگەوتو چاوەڕوانی نوێژی كرد، ئەوه بە هەر هەنگاوێك لە هەنگاوەكانی هەڵیهێناوه بۆ مزگەوت، فریشتەكان دە چاكەی بۆ دەنووسن.
**سزا:** {«**أَنَّهُ ﷺ ذَكَرَ الصَّلاَةَ يَوْماً، فَقَالَ: مَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَتْ لَهُ نُورًا وَبُرْهَانًا وَنَجَاةً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهَا لَمْ يكُنْ لَهُ نُورٌ، وَلاَ بُرْهَان، وَلاَ نَجَاة وَكَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ قَارُونَ، وَفِرْعَونَ، وَهَامَانَ، وَأُبَيِّ بْنِ خَلَفٍ**»}[2]
واته: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ باسی نوێژی دەكرد، فەرمووی: هەر كەسێك پارێزگاری لە نوێژەكانی بكات، ئەوه لە ڕۆژی دوایی بۆی دەبنە ڕووناكیو بەڵگەو ڕزگاركەر (لە ئاگری دۆزەخ)، وە هەر كەسێك پارێزگاریان لێ نەكات (واته: ئەنجامیان نەدات)، ئەوه لە ڕۆژی دوایی نە ڕووناكی هەیە (بەرچاوی خۆی ببینێ) وە نە بەڵگەیەكی بە دەستەوەیە (لە كاتی پرسیارو وەڵامی قیامەت)، وە نە ڕزگار كەریشی هەیە، وە لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ قاروونو هامانو فیرعەون ئوبەی كوڕی خەلەف كۆدەكرێتەوە!!

## ڕوونكردنەوە

١)- دەستنوێژ شوشتن بە جوانی هۆی قبووڵ بوونی نوێژەكانو هەڵوەرینی گوناهەكانە، وەك لەم فەرموودەدا هاتوه، خۆشەویستی خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوء، خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِن تَحْتِ أَظْفَارِهِ**»}[3]، واته: هەر كەسێك دەستنوێژ بە جوانی هەڵبگرێ، گوناهەكانی لە جەستەی دەچنە دەر،

---

١) صحيح: أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٠٤٣) وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٩٦٠)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (١٠٨) وَمُسْلِمٌ برقم: (٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٠)، وَالنَّسائِيُّ فِي الكُبرى برقم: (٥٩١٤)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢).
٣) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٢٤٥)، وَأَحْمَدُ برقم: (٤٧٦).

هەتاکو لە ژێر نینۆکی پەنجەکانیشی گوناهەکانی دەچنە دەر.

٢)- ناوهێنانی خوا لەکاتی دەستنوێژ هۆکارە بۆ تەواوی دەستنوێژ، چونکە پێغەمبەری پایەدار ﷺ فەرموویەتی: {«**لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ وُضُوءَ لَهُ، وَلاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ تَعَالَى عَلَيْهِ**»}[1] واتە: نوێژ بۆ کەسێك نیە کە دەستنوێژی نەبێ، وە دەستنوێژ بۆ کەسێك نیە کە ناوی خوای بەرزی لەسەر نەهێنێ (واتە: دەبێ لە سەرەتا بسم الله بکرێ، بەڵام زانایان لە شەرحی ئەم فەرموودە گوتوویانە: ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست ناوی خوا نەهێنێ نوێژەکەی دروست نیە، بەڵام ئەگەر بە لە بیر چوونەوە بێ ئەوە نوێژەکەی دروستە).

لە فەرموودەیەکی دی فەرموویەتی: {«**مَن تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ**»}[2]، واتە: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ وەك فەرمانی پێکراوە، وە نوێژ بکات وەك فەرمانی پێکراوە، دەبووردرێ لە کردەوە (خراپە)کانی رابردووی.

٣)- یەکەم کردەوەی دنیا کە مسوڵمان لە ڕۆژی دوای دەربارەی پرسیاری لێ دەکرێتەوە، بریتیە لە نوێژ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ، فَإِنْ صَلَحَتْ، فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ، فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ**»}[3] واتە: یەکەم کردەوە کە بەندە لە بە هۆیەوە لە ڕۆژی دوای لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی باش بوون ئەوە سەرفراز بووەو ڕزگاری بووە، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، (واتە: بە تەواوی ئەنجامی نەدابن) ئەوە خەسارەتمەندو زەرەرمەند بووە.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٠١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (١٤٤) عَنْ أَبِي أَيُّوب ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٨٦٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٦)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٣٨١٣)، وَإِبْنُ المُبَارَك برقم: (٩١٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٩٦٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ الإِسْنَاد، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (١٣٥٥)، قَالَ حُسَين سَلِيم أسد: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

کەواتـە: ئەگـەر نوێـژەکانت بـە تـەواوی ئـەنجام دابـێ‌و ڕێـك‌و پێـك بـن، ئـەوە گشـت کردەوەکانت ڕێك‌و پێك‌و تەواو دەبن، ئایا مەبەست لە ڕێك وپێکی نوێژ چییە؟ با گـوێ لـەم فـەرمووده بگـرین: {عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ قَـالَ: قَـالَ رَسُـوْلُ اللهِ ﷺ: «الصَّلاَةُ ثَلاَثَةُ أَثْلاَثٍ، الطُّهُورُ ثُلثٌ، وَالرُّكُوعُ ثُلُثٌ، وَالسُّجُودُ ثُلُثٌ؛ فَمَنْ أَدَّاهَا بِحَقِّهَا قُبِلَـتْ مِنْـهُ، وَقُبِـلَ مِنْـهُ سَـائِرُ عَمَلِـهِ، وَمَـنْ رُدَّتْ عَلَيْـهِ صَلاَتُهُ، رُدَّ عَلَيْـهِ سَـائِرُ عَمَلِـهِ»}[1] ، واتـە: ئـەبو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ سێ بەشـە، بەشـێکی پـاك‌و خـاوێنی‌و دەسـتنوێژگرتنە، بەشێکیشـی ڕکووعە، بەشێکیش سوجدەیە، هەر کەسێك ئەنجامیان بدات بە تەواوی مافی هـەر یـەك لەو سێ بەشە بدات، ئەوە نوێژەی لێ قبووڵ دەکرێ (وە ئەگەر نوێژەکانی لێ قبووڵ کرا) هەموو کردەوەکانی دیکەشی لێ قبووڵ دەکرێ، وە هەر کەسـێکیش نوێژەکـەی بەسـەردا بدرێتەوەو لێی قبووڵ نەکرێ، ئەوە هەموو کردەوەکـانی دیکەشـی بەسـەردا دەدرێتـەوەو لێی قبووڵ ناکرێ!

٤)- ڕەنگە کەسێك بڵێ: من نوێژان دەکەم، بەڵام هەندێ جار لەبەر تەنبـەڵی ئـەنجامیان نادەم، ئایا چۆن حیسابم لەگەڵ دەکرێ لەسەر ئەو نوێژانەی لە دەسـتم داون؟ ئەنجامـدانی نوێـژە سـوونەتەکان زۆر بکـەی، بـەڵام بـا گـوێ لـە خۆشەویسـتی خـوا ﷺ بگـرین، لـە حەدیسێکی صەحیح دا فەرموویەتی لە ڕۆژی دوایی خوا لێ پرسینەوە لەگەڵ بەنـدەکانی دەکات لەسەر فەرزەکان، ئەگەر فەرزەکانی ناتەواویان تێـدابێ، ئـەوە خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: { انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَيُكَمَّلُ بِهِ مَا نَقَصَ مِنْ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ}[2]، واتە: تەماشا بکەن، ئایا ئەو بەندەی من هیچ سوننەتێکی هەیە، تاکو کەم‌و کوڕیی فەرزەکانی پـێ تـەواو بکـرێ؟ ئنجـا هـەموو کردەوەکـانی بـەم شێوەیە دەبێ، (بۆ وێنە: ئەگەر زەکاتی مـاڵی نـەدابێ، ئـەو خێرانـەی کردوویـەتی بـۆی

---

[1] حسن صحيح، أخرجه البزار برقم: (٣٤٩)، تعليق الألباني: حسن صحيح، وحسنه الهيثمي.

[2] صحيح: أخرجه أحمد برقم: (٩٤٩٠)، وأبو داود برقم: (٨٦٤)، والنسائي برقم: (٤٦٦)، والبيهقي برقم: (٣٨١٣)، وابن المبارك برقم: (٩١٥)، والحاكم برقم: (٩٦٥) وقال: صحيح الإسناد، والدارمي برقم: (١٣٥٥)، قال حسين سليم أسد: إسناده صحيح، وصححه الألباني.

وەبەر زەکات دەخەن، ئەو ڕۆژووانەی لە مانگی ڕەمەزان چوواندوویەتی، ڕۆژووە سوننەتەکانی بۆ وەبەر دەخەن ... هتد.

٥)- ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: {«**مَنْ مَشَى إِلَى صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ فِي جَمَاعَةٍ فَهِيَ كَحَجَّةٍ، وَمَنْ مَشَى إِلَى صَلاَةِ تَطَوعٍ، فَهِيَ كَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ**»}[1] واتە: هەر کەسێك بچێ بۆ نوێژە فەرزەکان بە جەماعەت ئەنجامیان بدات ئەوە پاداشتی حەج کردنێکی بۆ هەیە، وە هەر کەسێك بچێ بۆ ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان ئەوە پاداشتی عومرەکی تەواوی بۆ دەنووسرێ.

٦)- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ ﴿٢٣٨﴾ ﴾البقرة[2]، واتە: نوێژەکان بپارێزن، جا ئایا پارێزگاریی لێکردنی نوێژەکان، چۆنو بە چ شێوەیەك دەکرێ؟ ئەم ئایەتە چەند واتایەك دەگەیەنێ:

- لە ڕووی کاتەوە بیانپارێزن، نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا بیانکەن ئاگاتان لێ بێ.
- لە ڕووی ڕواڵەتەوە بیپارێزەو نوێژەکەت بەو شێوە بکە کە شەریعەت دایناوە، وشەکان کە دەخوێنی بە ڕێكو پێکی بیانخوێنە، ڕکووعو سەجدە و تەحییات، ڕاوەستان جموو جۆڵەکان هەموو بە ڕێكو پێکی بن، خۆ مەجوولێنە ئاوڕمەدەوە ... هتد.
- لە ڕووی نێوەڕۆکەوە نوێژەکەت بپارێزە، کە لە ڕاستیدا نێوەڕۆك مەبەستی هەرە گەورەی نوێژە، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾المؤمنون، واتە: بە ڕاستی بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا گەردەنکەچنو بە شەرمو لێ ترسانو سامو هەیبەت کردن لە خواوە ڕادەوەستن.

---

١) حسن: أخرجه الطبراني في "الكبير" برقم: (٧٥٧٨)، وحسنه الألباني.

٢) تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز، سوورەتی النساء.

- وە مانای پارێزگاریی کردن لە نوێژ ئەوەیە کە داخوازییەکانی نوێـژ جێبـەجێ بکـرێن، وەك کردنی چـاکەو خـۆ دوورگـرتن لـە خراپـە، چـونکە خـوا فەرمووییـەتی: ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ ﴿٤٥﴾ ﴾العنکبـوت، واتە: بێگومان نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە هەموو قسەیەکی خراپو لـە هـەموو کردەوەیەکی خراپ.

کەواتە: دەبێ تۆ مادام نوێژکەری ئەگەر بتـەوێ نوێژەکـەت بپـارێزی، دەبـێ شـوێنەواری نوێژەکەت لە تۆدا پەیدابێ کـە بریتیـە لـە چـاکەکردن و بـەپێی توانـا هـەموو چـاکەکان بکەی، وە خۆت دوور بگری لە هەموو خراپەکان.

٧)- نوێژ نەکردن گوناهێکی یەکجار زۆر گەورەیـە، وە هەنـدێك لـە زانایـان گوتوویانـە: نوێژنەکـەر کـافرە، بەڵگەشـیان لـەوبارەوە ئـەم فەرموودەیـە: {«**الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ**»}[1]، واتـە: ئـەو پەیمانـەی کـە لـە نێـوان ئێمەو کافراندا هەیە نوێژە، هەر کەسێك نوێژێ نەکات کوفری کردوە، یان کافر بووە!

شایانی باسە زانایان هەر لە زووەوە ڕاجیاییان هەبووە دەربارەی حـوکمی نوێژنەکـەر، لـە زانایانی پێشین:

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: نوێژ نەکەر کافرە، لە بازنەی ئیسلام دەچێتەدەر.

پێشەوایان ئەبو حەنیفەو مالیكو شافیعی دەڵێن: فاسقە، بەڵام کافر نیە.

لەو سەردەمەی خۆشمان دەربارەی نوێژ نەکەر پرسیار لە (إبن العثيمين) دەکرێ، لـە وەڵام دەڵێ: ئەو کەسەی نوێـژ نـەکات کـافرەو لـە بازنـەی ئیسـلام چـۆتەدەر، ئەگـەر خێزانـی مسـوڵمان بـێ نیکاحەکـەی لێـی هەڵدەوەشـێتەوە، ئـەو ئاژەڵـەی سـەری دەبـڕێ نـابێ مسوڵمانان بیخۆن، ڕۆژووی لێ وەرناگیرێ، خێری لێ وەرناگیرێ، نابێ ڕێگەی پـێ بـدرێ

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٠٣٩٦)، وَأَحْمَد برقم: (٢٢٩٨٧)، والتِّرمذيُّ برقم: (٢٦٢١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٣)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٠٧٩)، وَإِبْنُ حِبَّان برقم: (١٤٥٤)، والحاكم برقم: (١١)، وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد وَصَحَّحَهُ كُل مِنَ المُنَاوِي والعراقي والألباني وشعيب الأرنؤوط.

بچێتە حەرەم، وە ئەگەر مردیش نابێ نوێژی لەسەر بکرێو کفن بکرێ، وە نابێ لەگەڵ مسوڵمانان بنێژرێ.

بەڵام ڕای پەسند ئەوەیە ئەگەر کەسێك باوەڕی وابێ نوێژ فەرزنیەو خوا لەسەری پێویست نەکردوە بۆیە ئەنجامی نادات، ئەوە گومان لە کافر بوونی ئەو کەسە نیە، وە بە تەئکید لە بازنەی ئیسلامو مسوڵمانەتی چۆتەدەر، بەڵام ئەگەر باوەڕی وابێ خوا لەسەری فەرز کردوە، ئەگەر ئەنجامی نەدات گوناهبارەو خوا سزای دەدات، بەڵام ئەگەر لەبەر تەنبەڵی نوێژ ئەنجام نەدات، ئەوە کافر نیە، بەڵام گوناهێکی یەکجار زۆر گەورەی کردوەو پێی فاسق بووە.

٨)- ترسناکی ئەنجام نەدانی نوێژ لەم دوو فەرموودە دەردەکەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کەسێك کە یەکێك لە پێنج نوێژە فەرزەکان ناکات، فەرموویەتی: {«مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ»}[1]، واتە: هەر کەسێك نوێژی عەسر نەکات ئەوە کردەوە باشەکانی هەڵدەوەشێننەوە، هەروەها فەرموویەتی: {«الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ»}[2] واتە: ئەو کەسەی نوێژی عەسری دەچێ وەك ئەوە وایە ماڵو منداڵی هەموو لە دەست بچێ.

ئەدی ئەو کەسەی کە ڕۆژێ پێنج جاران خوای پەروەردگار بانگی دەکاتو وەڵامی خوای گەورە ناداتەوە، دەبێ حیسابی لە لای خوا چۆن بێ؟

٩)- لەم فەرموودەی دووەم کە وەك ناونیشان هێنامان پێغەمبەری خوا نوێژنەکەری لەگەڵ قاروونو هامانو فیرعەون ئوبەی کوڕی خەلەف حیساب کرد، کە دیارە ئەوەش بە مانای ئەوە نایێ کە ئەو کەسە کافرە، بەڵام بە ئەندازەی وازهێنانی لە نوێژکردنو کەمو کوڕیەکانی لە ئاگری دۆزەخ لەگەڵ ئەو کافرە ملهوڕانە دەمێنێتەوە، وە خوای تۆڵەسێنەر کە باسی ئەهلی دۆزەخ دەکات دەفەرموێ: کاتێك بەهەشتیەکان پرسیاریان لێ دەکەن: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾﴾المدثر، واتە: ئایا چ شتێك

---

١) صحيح: أخرجه البخاريُّ برقم: (٥٢٨) عَنْ بُرَيْدَةَ رضي الله عنه.

٢) صحيحٌ: أخرجه أبو داوُد برقم: (٤١٤) عنْ مَالِكٍ عَنْ نافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني.

ئێوەی پەلکێش کرد بۆ سەقر (کە ناوێکە لە ناوەکانی ئاگر)؟ گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین.

کە پێم وایە ئەم هەڕەشەیە بەسسە بۆ کەسێك ئەگەر ترسی خوای لە دڵدابێ‌و نوێژنەکەربووبێ تا ئێستا لەم ڕۆ بە دواوە تۆبەیەکی تەواو ڕاست‌و دروست بکات لەگەڵ خوای پەروەردگارو دەست بە نوێژەکان بکاتەوەو پارێزگاریان لێ بکات.

١٠)- سزای کەسێك کە نوێژ دەکات‌و ساردوسڕی‌و ئیهمالی تێدا دەکات دۆڵێکە لە دۆڵەکانی دۆزخ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾الماعون، واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە لە نوێژەکانیان بێئاگان، جا ئەمە مانای چی دەگەیەنێ، یانی مەفهووم مخالفەکەی چیە؟ چەمکی پێچەوانەی ئەم دوو ئایەتەیە، کە خوای پەروەردگار دەربارەی نوێژکەرانی ڕاست‌و دروست‌و خۆ بۆخوا یەکلاکەرەوە فەرموویەتی: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ ﴾المؤمنون، واتە: بە ڕاستی بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا گەردەنکەچن‌و بە شەرم‌و لێترسان‌و سام‌و هەیبەت کردن لە خواوە ڕادەوەستن، یان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ٩ ﴾المؤمنون، وە ئەوانەی پارێگاری لەسەر نوێژەکانیان دەکەن.

**پاداشت:** {«إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ زَمَانَ صَبْرٍ، لِلْمُتَمَسِّكِ فِيهِ أَجْرُ خَمْسِينَ شَهِيداً»، فَقَالَ عُمَرُ: يا رَسُوْلَ اللهِ! مِنَّا أَوْ مِنْهُمْ؟ قَالَ: «مِنْكُمْ»}[1].

واته: دڵنیابن له دوای ئێوه ڕۆژگاری ئارامگرتن هه‌یه (یانی: خراپه‌کاریی هێنده زۆر ده‌بێ، ده‌بێ ئارامی تێدا بگرن)، جا هه‌ر که‌سێك له‌و کاته‌دا باش ده‌ست به (قورئان‌و سوننه‌ته‌وه بگرێ)، ئه‌وه پاداشتی په‌نجا شه‌هیدی هه‌یه، عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب، گوتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! (پاداشتی په‌نجا شه‌هید)ی ئێمه‌ی بۆ هه‌یه، یان له خۆیان؟ فه‌رمووی: (پاداشتی په‌نجا شه‌هیدی) ئێوه‌ی بۆ هه‌یه.

**سزا:** {«قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا، لاَ يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلاَّ هَالِكٌ»}[2].

واته: بێگومان له‌سه‌ر سپیاییه‌ك (كه قورئان‌و سوننه‌ته) به جێم هێشتوون، شه‌وه‌كه‌ی وه‌ك ڕۆژ وایه، هیچ كه‌س لێی لانادات دوای من، حه‌تمه‌ن له نێو چووه (و گومڕا بووه).

## ڕوونکردنه‌وه

١)- پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ زۆر به دڵنیایی ده‌فه‌رموێ هه‌ر که‌سێك له‌و ڕۆژگاره‌دا، که پڕه له خراپه‌و گوناح‌و تاوان، خۆی بپارێزێ‌و دینداریه‌کی ته‌واو بکات، بێ ئه‌وه‌ی زیادی بکات‌و بێ ئه‌وه‌ش که‌می بکاته‌وه، پاداشتی په‌نجا شه‌هیدی صه‌حابانی بۆ ده‌نووسرێ.

٢)- ده‌رباره‌ی ئه‌و پاداشته‌ش که پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی، سه‌دا سه‌د ڕاسته، چونکه خوا ده‌رباره‌ی فه‌رمایشته‌کانی فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير): (١٣٩٤)، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٨٥) عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ رضي الله عنه، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيحٌ.

﴿يُوحَىٰ ٤﴾ النجم. واتە: موحەممەد ﷺ لە خۆوە قسان ناکات، بەدڵنیایی ئەوەی دەیڵێ وەحیەو بۆی نێردراوە.

٣)- هەرکەسێك کە ئەو نووسراوە دەخوێنێتەوە، با دڵنیابێ ئەو ڕۆژگارەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی فەرمووە، ئەو ڕۆژگارەی ئێمەش دەگرێتەوە کە هەر چوار لامان دەورە دراوە، بە گوناحو تاوانو خراپەو ڕازاندنەوەی قەدەغەکانو ناشیرین کردنی واجبە شەرعیەکان، هەوڵدانێکی زۆر هەیە بۆ دروست کردنی جیاوازی نێوان مسوڵمانانو چاندنی تۆوی فەسادو حەسوودیو ڕقو کینەو گومانی خراپ بە یەکدی بردن لە نێو دڵو دەروونی مسوڵمانان، دەبێ وریا بین. ئەوەتا دەبینی لەسەر هەندێ وردە بابەتی خیلافی نێوان زانایان هەندێ لە گەنجان نێوانیان تێکدەچێو دەگاتە ئەو حاڵەتەی کە غەیبەت کردنی یەکدیان پێ واجب بێو...، زۆر شتی دی کە ئێرە جێی باس نیە.

٤)- ئەی گەنجانو لاوانی دیندارو خواناسو هەڵگرانی ئاڵاو مەشخەڵی ئیسلام! ئەی ئەوانەی خۆتان بە شوێن پێ هەڵگری موحەممەد المصطفی دەزانن‌و، هەموو ئومێدتان ئەوەیە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا بوونایەوو جەنگو جیهادتان لە خزمەتی کردبووایە، تا پاداشتی هەرە گەورە کە بەهەشتە بە دەستتان هێنابا، دە هەڵسن‌و قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵماڵن، ئەوەی تا ئێستا پێتان وا بووە خەیاڵە لێت بووە واقیعو، دەتوانی ئێستا ئەو ئاواتو ئومێدانەت بێنیە دی بە هۆی جێبەجێ کردنی تەنیا ئەو فەرموودەی یەکەم، کە بریتیە لە دەستگرتنێکی تەواو بە دینی خواو سوننەتی ڕەسول الله ﷺ!

٥) جوان دەست گرتنت بە قورئانو سوننەتو خۆ دوورگرتنت لە بیدعەتو داهێنان لە دینداریی نیشانەی خۆشەویستیتە بۆ خوا، خواش دەربارەی جوان شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٣١﴾ آل عمران، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن لە گوناهەکانیشتان دەتانبووری، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، مەبەست لە دەست گرتن بە دین، بریتیە لەوەی کە

واجبه‌كانی خوا نه‌چووێنیو قه‌ده‌غه‌كانیشی نه‌شكێنی، جا واجبه‌كانو قه‌ده‌كانیش چین؟ دیاره له‌ ڕێی هه‌وڵدانت بۆ فێربوونی زانستو زانیاریی ده‌رباره‌ی شه‌ریعه‌ت بۆت ده‌رده‌كه‌وێ واجبه‌كان چیین؟ وه‌ قه‌ده‌غه‌كانیش چین؟

وێنه‌ی واجبێك: نه‌چواندنی نوێژه‌كان، نموونه‌ی قه‌ده‌غه‌یه‌ك: زیاد كردن یان كه‌م كردنی عیباده‌تێك له‌ دینداریی دا!

وه‌ هه‌روه‌ها هه‌ر ده‌رباره‌ی ده‌ستگرتن به‌ قورئان پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ فه‌رمایشتێكدا فه‌رموویه‌تی: {**«إِنَّ اللهَ تَعَالَى لَيَرْفَعُ بِهَذَا الْقُرْآنِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ»**}[1]، واته‌: بێگومان خوای به‌رز كۆمه‌ڵێك به‌رزده‌كاته‌وه‌ به‌هۆی ئه‌م قورئانه‌و، هه‌ندێ خه‌ڵكیشی پێ نزم ده‌كاته‌وه‌.

٦)- ئه‌گه‌ر سه‌رنج بده‌ین فه‌رمووده‌ی دووه‌م هه‌ڕه‌شه‌یه‌كی زۆر توندی تێدایه‌ بۆ هه‌ر كه‌سێك كه‌ به‌ شێوازێكی ڕاستو دروست دینداریی نه‌كات، ئه‌ویش له‌ نێوچوونو گومڕابوونه‌.

٧)- پێویسته‌ زۆر توند بین له‌سه‌ر خۆمان، هه‌وڵبده‌ین شتێك نه‌كه‌ین خواو پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمانیان له‌سه‌ری نه‌بێو پێی ڕازی نه‌بن، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: {**«عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ»**}[2]، واته‌: داواتان لێ ده‌كه‌م په‌یوه‌ست بن به‌ سوننه‌تی منو سوننه‌تی پێشه‌وایه‌ سه‌ر ڕاسته‌كانو ڕێی ڕاست نیشاندراوه‌كان، وه‌ به‌ ددانه‌كانتانه‌وه‌ زۆر توند بیانگرنو پێیانه‌وه‌ پابه‌ندبن، وه‌ داواتان لێده‌كه‌م خۆتان بپارێزن له‌ شته‌ داهێنراوه‌كان (له‌ دین) به‌ڕاستی هه‌موو داهێنراوێك (له‌ دین) لادانه‌، هه‌موو لادانێك له‌ دین (ئینسان به‌ره‌و گومڕایی ده‌باتو) گومڕاییه‌.

---

[1] صحيح: أخرجه أحمد برقم: (٢٣٢)، ومسلم برقم: (٨١٧)، وابن ماجة برقم: (٢١٨)، والدارمي برقم: (٣٣٦٥)، وأبو عوانة برقم: (٣٧٦٢)، وابن حبان برقم: (٧٧٢)، والبزار برقم: (٢٤٩)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: (٢٦٨٢).

[2] صحيح: أخرجه أحمد برقم: (١٧١٨٢)، وابن ماجة برقم: (٤٣)، وصححه شعيب الأرنؤوط.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دوایی کۆمەڵێك لە ئۆممەتی من لێم دوور دەخرێنەوە، منیش دەڵێم: ئاخر ئەی پەروەردگارم ئەوانە لە ئۆممەتی منن! پێم دەگوترێ: {«**إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ فَأَقُولُ: سُحْقَاً سُحْقَاً**»}[1]، واتە: ئەوانە لایانداوە دوای تۆ، منیش دەڵێم: دووربخرێنەوە، دووربخرێنەوە، یان دوورخرێنەوە.

وە لە هەمان کاتدا دەبێ زۆر بە بەزەیی‌و دڵسۆزو خەمخۆر بین بۆ کەسێك کە تووشی لادان‌و سەرپێچیەك بووە لە شەریعەت، جا بە هۆی ئەوەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەین دەبینە باشترینی خەڵکی، وەك خوا جل جلاله دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ... ﴿١١٠﴾﴾آل عمران، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵکی وەدیهێنراون فەرمان بە هەموو پەسندێك دەکەن‌و، ڕێگریی لە هەموو ناپەسندێك دەکەن‌و، بروا بە خوا دێنن.

بەڵام ئەوەی گرنگە لە کاتی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە ڕەچاو بکرێ، بریتیە لە: هەبوونی حیکمەت، ئەمەش فەرمانی خوایە، وەك فەرموویەتی: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ ... ﴿١٢٥﴾﴾النحل، واتە: بانگەوازی بۆ ڕێی پەروەردگارت بکە بەو پەڕی کاربەجێی‌و لێزانی.

٨)- وە هەر کەسێك بە شوێن سوننەتی (واتە: ڕێگەی) غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێ، بە دڵنیایی بەرەو گومرایی دەچێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {«**فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ**»}.

کەواتە: داهێنانی عیبادەتێك کە لە دین بوونی نەبێ، ئەوە دەبێتە هۆی گومڕا بوونی ئەو کەسەی ئەو شتەی داهێناوەو ئەوانەش کە بە دوای ئەودا دەڕۆن!!

٩)- دەبێ زۆر سوور بین لەسەر دەستگرتنمان بە سوننەتی پێغەمبەرمان، بەڵام دەستپێوە گرتنێکی گوفتاریی‌و کرداری، چونکە بە دڵنیایی تاکە ڕێگەی ڕزگاری‌و بە

[1] صحيح: أخرجه أحمد برقم: (٢٢١٨٣)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح.

ده‌ستهێنانی ڕه‌زامه‌ندی خوای په‌روه‌ردگار ڕێبازی پێغه‌مبه‌رمانه ﷺ، وه هه‌ر کارێك که له دینداریی ده‌کرێ‌و ده‌قی قورئان‌و سوننه‌تی له‌سه‌ر نه‌بێ ڕه‌فزکراوه‌یه‌و پاداشتی له‌سه‌ر نیه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌م دوو فه‌رمووده موباره‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ:

یه‌که‌م: {«مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»}[1]، واته: هه‌ر که‌سێك شتێك له‌م دینه‌مان دابێنێ‌و تێیدا نه‌بێ ئه‌وه ڕه‌د کراوه‌یه‌و لێی وه‌رناگیرێ.

دووه‌م: {«مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»}[2]، واته: هه‌ر که‌سێك کرده‌وه‌یه‌ك ئه‌نجام بدات فه‌رمانی ئێمه‌ی له‌سه‌ر نه‌بێ، ئه‌وه ڕه‌د کراوه‌یه‌و لێی وه‌رناگیرێ.

به دڵنیایی واز هێنانان له هه‌ر سوننه‌تێك واته: داهێنانی بیدعه‌تێك، چونکه وه‌ك زانایان‌و پێشه‌وایان‌و سه‌رمه‌شق‌و چاوساغان‌و مامۆستایان فه‌رموویانه:

کاتێك سوننه‌تێك ته‌رك ده‌کرێتن حه‌تمه‌ن بیدعه‌تێك شوێنی ده‌گرێتن.

١٠)- هیچ شتێك نه‌ماوه خێری بۆ ئه‌و ئۆممه‌ته هه‌بووبێ‌و پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ڕوونی نه‌کردبێته‌وه، وه‌ك فه‌رموویه‌تی: {«مَا بَقِيَ شَيْءٌ يُقَرِّبُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُبَاعِدُ مِنَ النَّارِ، إِلا وَقَدْ بُيِّنَ لَكُمْ»}[3]، واته: هیچ شتێك نه‌ماوه نیزیکتان بکاته‌وه له به‌هه‌شت‌و دوورتان بخاته‌وه له ئاگر، مه‌گه‌ر بۆم ڕوون کردوونه‌ته‌وه (و پێم ڕاگه‌یاندوون)، وه ئه‌و ئایه‌ته‌ش کافی‌و شافییه له‌وباره‌وه، که خوا سبحانه وتعالى فه‌رموویه‌تی:

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ۝٣﴾ المائدة، واته: ئه‌مڕۆ دینه‌که‌تانم ته‌واو کرد.

که‌واته: ئیدی مه‌جالی زیاد کردن‌و که‌م کردنی تێدا نه‌مایه!

---

١) صحيحٌ: مُتَّفقٌ عليه: أخرجهُ البخاريُّ برقم: (٢٦٩٧)، ومُسلمٌ برقم: (١٧١٨).

٢) صحيحٌ: أخرجهُ أحمد برقم: (٢٥١٧١)، ومُسلم برقم: (٤٥٩٠).

٣) صحيحٌ: أخرجهُ الطبراني في "الكبير" برقم: (١٦٤٧)، وصحّحَهُ الألباني.

**پاداشت:** {«مَنْ دَعَا إِلَى هُدَىً كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً»}[1]

واته: هەر کەسێك خەڵكی بەرەو هیدایەت بانگ بکات بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون پاداشتی هەیەو، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوانیش کەم ببێتەوە.

**سـزا:** {«مَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً»}[2]

واته: هەر کەسێك خەڵكی بەرەو گومڕایی بانگ بکات ئەوە بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی شوێنی کەوتوون گوناهی هەیە، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهی ئەوانیش کەم ببێتەوە.

## ڕوونکردنەوە

١)- بانگەوازی کردن بۆ ڕێگەی هەق کە ئیسلامەو هیدایەت دانی خەڵكی بۆ ئەو ڕێبازە پاكو چاكە فەرمانی خوای بالادەستە بۆ موسڵمانان، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾آل عمران،

واته: وە (ئەی موسڵمانینە!) با کۆمەڵێکتان هەبن بانگەواز بۆ چاکە بکەن‌و، فەرمان بە شتە پەسەندەکان بکەن‌و، ڕێگری لە شتە ناپەسەندەکان بکەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ أحمد برقم: (٩١٤٩)، ومسلمٌ برقم: (٢٦٧٤)، وأبو داود برقم: (٤٦٠٩)، والترمذي برقم: (٢٦٧٤) وقال: حسنٌ صحيحٌ، وابنُ ماجه برقم: (٢٠٦)، وأبو يعلى برقم: (٦٤٨٩)، وابن حبان برقم: (١١٢)، والدارميُّ برقم: (٥١٣) عَنْ أبي هُريرةَ ﷺ.

٢) صحيحٌ: **المصدر نفسه.**

کەواتە: ئەوانەی هەڵدەستن بە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بە مەبەستی هیدایەتدانی خەڵك، کۆمەڵە کەسێکی ناوازەو زۆر تایبەتی خوای باڵادەستن کە ڕەحمەتی خۆی پێ تایبەت کردوونو هەڵیبژاردوون وەك دەفەرموێ: ﴿ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾آل عمران، واتە: وە (خوا) هەر کەسێکی بیەوێ تایبەتی دەکات بە بەزەیی خۆیەوە، وە خاوەن بەخششی زۆر مەزنە.

٢)- وەك پێشتر باسمان کردوە، بە دەقی قورئان باشترینی خەڵکی ئەوانەن ڕێنمایی خەڵکی دەکەن بۆ ڕێی ڕاست، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ...﴾آل عمران، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵکی وەدیهێنراون: فەرمان بە هەموو پەسندێك دەکەنو، ڕێگریی لە هەموو ناپەسندێك دەکەنو، بڕوا بە خوا دێنن.

٣)- بیرکردنەوەی لەو پاداشتەی کە لە کاتی هیدایەتدانی خەڵکی بەدەستی دەهێنن دەبێ گەورەترین هۆکارو هاندەرمان بێ بۆ ئەوەی بەردەوام بین لەسەر بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ ئیسلام، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: هەر کەسێك خەڵکی بەرەو هیدایەت بانگ بکات بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون پاداشتی هەیە.

٤)- ڕەحمەتو فەزڵو بەخششی خوا لەو فەرموودەیەی یەکەم دەردەکەوێ، یانی: ئەگەر مسوڵمانێك ڕێنمایی سەد کەس بکاتو لەسەر دەستی هیدایەت وەربگرن، پاداشتی هەر هەمووانی بۆ دەنووسرێ بەبێ ئەوەی یەك چاکەش لە پاداشتی وان کەم بکاتەوە، وە هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**«مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ اجْرِ فَاعِلِهِ»**}[1]، واتە: هەر کەسێك ڕێنمایی خەڵکی بکات بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە، ئەوە بە ئەندازەی ئەو کەسەی کارە چاکەکەی ئەنجام داوە

---

١) صحيح: أخرجه أحمد برقم: (٥ ٢٢ ١٧)، ومسلم برقم: (١٨٩٣)، وأبو داود برقم: (٥١٢٩)، والترمذي برقم: (٢٦٧١) وقال: حسنٌ صحيح، وابن حبان برقم: (٢٨٩)، والبخاريُّ في "الأدب المفرد" برقم: (٢٤٢)، والطبرانيُّ في "الكبير" برقم: (٦٢٢)، والبيهقيُّ في "السنن الكبرى" برقم: (١٨٣٠٠).

پاداشتی بۆ دەنووسرێ.

٥)- هاوكاری كردن‌و یارمەتی دانت بۆ خەڵكی دەبێتە هۆی ئەوەی خوای پەروەردگار هاوكارت بێ‌و یارمەتیت بدات، ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: {«وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ»}[1]، واتە: بەردەوام خوا لە یارمەتیدانی بەندەی خۆی دایە، هەتا بەندە لە یارمەتیدانی برای خۆی دابێ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۝٢﴾المائدة، واتە: هاوكاری‌و دەستبارگری یەكدی بكەن لەسەر ئەنجامدانی كاری چاك‌و پارێزكاری.

كەواتە: بەر لەوەی بیر لە هیدایەتدانی خەڵك بكەیەوە، بیر لەم پاداشتە مەعنەویە بكەوە كە لە ئەنجامی ئەم كارەدا بە دەستی دێنی.

٦)- گەورەترین كاری مسوڵمان بریتیە لە بانگەوازی بۆ ئایینی خوای پەروەردگار، گومان لەوەش نیە مرۆڤ لە كاتی بانگەواز تووشی ئەزیەت‌و ئازارو گرفتی زۆر دەبێ، چونكە رێی چوونە بەهەشت بە گوڵ نەرازاوەتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {«حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ»}[2] واتە: بەهەشت بە ناخۆشی دەورە دراوە، دۆزەخیش بە خۆشی‌و ئارەزووەكان دەورە دراوە، وە هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ تووشی ئەو گرفتانە بوونەو زۆر بە زیادەوەش كە ئەمرۆ منو تۆ دێنە رێمان، بەڵام نە لە برسان‌و نە لە ترسان نەكەی واز لەو بانگەوازە بێنێ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر گەورەیی ئەم كارە دەفەرموێ: {«بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً»}[3] واتە: لە منەوە رایبگەیەنن‌و بڵاوی بكەنەوە، ئەگەر یەك ئایەتیش بێ، كام مسوڵمان هەیە ئەمرۆ بە سەدان ئایەت‌و فەرموودەی نەبیستبێ‌و لەبەری نەبێ، كەچی ئامادە نیە

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٢١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٩٩)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٤٩٤٦)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٤).

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٦٩٦)، وعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١٣١١)، ومُسْلِمٌ برقم: (٢٨٢٢)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٨٤٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥٥٩)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٧١٦).

٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٥٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٥٤٢)، وَالدَّيْلمِيُّ برقم: (٢٠٨١).

بە مانگو بە ساڵیش لە یەك دوو مەجلیس باسی بکات! بە داخەوە جگە لەوەی بە خۆیان وازیان هێناوە هەمیشە هەوڵی ساردبوونەوەی ئەوانەش دەدەن کە خەریکی ئەو کارە گەورەو گرانەن!

مەبەستم لە: لە برسانو لە ترسان، ڕزقو ڕۆزیو ژیانو مردنە، کە ئەم دووەش خوای گەورە کۆتایی پێهێناوە تەنیا بە دەستی خۆیەتی، هەردووکیان لە کاتی خۆیو لە شوێنی خۆی دەتگاتێ، بە بەڵگەی ئەوە خوا لە قورئان دەربارەی مردن فەرموویەتی: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ٣٤ ﴾ الأعراف.

وە هەروەها پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی ڕزقو ڕۆزی دەفەرموێ: {«**لَوْ أَنَّ ابْنَ آدَمَ هَرَبَ مِنْ رِزْقِهِ كَمَا يَهْرُبُ مِنَ الْمَوْتِ، لأَدْرَكَهُ رِزْقُهُ، كَمَا يُدْرِكُهُ الْمَوْتُ**»}[1] واتە: ئەگەر ئادەمیزاد لەو ڕزقەی (خوا بۆی داناوە) ڕابکاو هەڵبێ هەروەك چۆن بە (هەموو شێوەیەك) لە مردن ڕادەکاو هەڵدێ، ئەوە ئەو ڕزقو ڕۆزیەی (خوا بۆی داناوە) دەیگاتێ (لە کاتو شوێنی خۆی) هەروەك چۆن مردنیش (لە کاتو شوێنی خۆی) دەیگاتێ.

بەڵام سوپاس بۆ خوا کە کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەی گیراوە بەوەی بەردەوام خەریکی ئەم دەعوەو بانگەوازە بن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {«**لا يَزَالُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ يَغْرِسُ فِي هَذَا الدِّينِ بِغَرْسٍ يَسْتَعْمِلُهُمْ فِي طَاعَتِهِ**»}[2]، واتە: خوای زاڵی پایەدار بەردەوام لەم دینەدا نەمام دەنێژێ، وە لە فەرمانبەریی خۆیدا بەکاریان دێنێ. کە گومان لەوەدانیە ئەو نەمامانە ئەو گەنجانەن هەمیشە خەریکی فێر بوونی زانستو زانیاری شەرعین، وە دواتر هەر ئەوانەن دەبنە بانگخوازو خەڵکی فێری ئەو ئاینە دەکەن، کە ئەوە مانای بەکارهێنانیانە لەلایەن خوای باڵادەستەوە[3].

٧)- چۆن بۆ خۆمان پێمان خۆشە بچینە بەهەشت دەبێ ئاواش لە خەمی خەڵك دا بین،

---

١) حسن: أخرجه البيهقي في "شعب الإيمان" برقم: (١١٩٢)، وحسنه الألباني.
٢) حسن: أخرجه أحمد برقم: (١٧٨٢٢)، وابن حبان برقم: (٣٢٦)، حسنه شعيب الأرنؤوط.
٣) هەندێ لە ڕەوشتەکانی ئیماندار، لاپەڕە: ١٦٥.

ئەگەر وانەبین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمانمان تەواو نیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«لا يُؤمِنُ احَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»}[1]، واتە: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ برای مسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ.

٨)- ئەنجامدانی گوناح بە تەنیاو بڵاو نەکردنەوەی زۆر باشترەو جێی ئومێدە خوا لێی ببورێ، بەڵام کەسێك کە گومڕابووەو گوناهێکی کردوە بێ لە نێو خەڵکی باسی بکات بۆ ئەوەی ئەوانیش بەرەو ئەم گومڕایی‌و خراپەکارییە ڕابکێشێ، خوا بەڵێنی داوە لە خاوەنی ئەم گوناهە نەبورێ، وەك لەم فەرموودە هاتوە، ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: خوا ﷺ فەرمووی: {«كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى، إلاَّ الْمُجَاهِرِينَ»}[2]، واتە: هەموو ئوممەتەکەم دەبووردرێن لە گوناهان تەنیا ئەوانە نەبێ کە گوناهان دەکەن‌و دوایی دێن لە نێو خەڵکی باسی دەکەن.

٩)- زۆر گرنگە ئەوەی بۆ خەڵك باسی دەکەین لە کاری چاکە بۆ خۆمان بە کردەوە ئەنجامان دابێ، وە ئەوەش کە باسی دەکەین لە کردەوەی خراپ لە خۆمانمان قەدەغە کردبێ‌و خۆمانمان لێ دوورگرتبێ.

١٠)- هەندێك لە سیفەتەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو، کە پێشتر لە کتێبی (هەندێ لە ڕەوشتەکانی ئیماندار) ڕوونکراونەتەوە:

١ - {لەسەر دنیای ئەم زەمینە هەوڵی زۆر بدە، بەڵام هەوڵبدە، ئەم هەوڵدانەت، بۆ دنیای سەر ئەم زەمینە نەبێ}

{زانیاری شەرعیت پێ بێ هەمیشە قسەت پێ دەبێ}

{کە تۆ جیای لە خەڵکی چونکە خاوەن زانستی}

{لەگەڵ هەبوونی زانست کردار دەبێتە پێویست}

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ أحمد برقم: (١٣٩٠١)، وعبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١١٧٤)، والبُخَـاريُّ بـرقم: (١٣). ومُسْلِمٌ برقم: (٤٥). والتِّرمذيُّ برقم: (٢٥١٥) وقال: صحيحٌ، والنَّسَائيُّ برقم: (٥٠١٦)، وابْنُ ماجَة برقم: (٦٦)، والدَّارميُّ برقم: (٢٧٤٠).

٢) صحيحٌ: أخْرجَهُ البُخاريُّ برقم: (٥٧٢١)، ومُسْلِمٌ برقم: (٢٩٩٠).

{ئەوەی دەیڵێی بە گوفتار دەبێ بیکەی بە کردار}
{پێش گوفتار کردنە کردار بینە بیرخۆت خوای کردگار}
{بۆ خوا یان بۆ غەیری خوا ئەنجام دەدەی داوای خوا}
{ئەگەر بۆ غەیری خوا بوو وازبێنە لێی زوو بە زوو}
{بەڵام ئەگەر بۆ خوا بوو دڵنیابە ڕزگارت بوو}
{کەسێکی زۆر سادە بە خۆ دوورگر لە قسەی قەبە}
{باشترین گوێ ڕاگر بە چاکترین تەماشاکەر بە}
{گەر گوێگربی بۆ خەڵکی گوێشت بۆ دەگرن خەڵکی}
{زۆرترین چاکەت هەبێ با کەس گوێ بیستیان نەبێ}
{خراپەی خەڵکان با ونبێ لەبەر چاوت دیار نەبێ}
{خەمت خەمی خەڵك بێ خۆشیت خۆشی خەڵك بێ}
{داپۆشەری عەیبان بە چاوپۆشەری هەڵان بە}
{گەر وشەکان نەرم بن زۆرجار کاریگەر دەبن}
{تاکو کارت ئاسان بێ، دەبێ سینگت فراوان بێ}
{کاتێ قسەت بۆ دەکرێ، تەماشا مەکە کێ دەیڵێ}
{گوێگری هەموو قسان بە، هەڵبژێرەری چاکیان بە}
{زۆر لە خەڵك ببورە، زۆر کەم بڵێ بمبورە!!}
{بۆ قسان بابەڵگەت پێبێ، تاخەڵك متمانەی پێتبێ}

# پاداشتی وازهێنان له موناقه‌شه

# و

# سزای وازنه‌هێنان له موناقه‌شه

**پاداشت:** {«**أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا**»}[1] واتە: من گرەنتی خانوێك دەكەم لە دەوروبەری (یان بەشی خوارەوەی) بەهەشتیێ بۆ كەسێك، كە واز لە موناقەشەو شەڕە قسە كردن بهێنێ ئەگەر لەسەر هەقیش بێ.

**سزا:** {«**إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ، الأَلَدُّ الْخَصِمُ**»}[2] واتە: بێگومان بوغزێنراوترینی پیاوان لە لای خوا (كەسێكە) زۆر موناقەشەو شەڕەقسە دەكات.

## ڕوونكردنەوە

١)- وازهێنان لە موناقەشەی ناشەرعیی بەڵگەی گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەری خوایە، وە گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەی خۆشویستنی خوایە، وە هەر كەسێكیش خوای خۆشبوێ، بێگومان خوا لە گوناهی خۆش دەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٣١ ﴾آل عمران، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ بە شوێنی من بكەونو گوێڕایەڵیم بكەن، ئنجا خوا خۆشتانی دەوێو لە گوناهەكانتان خۆشدەبێ، وە خوا لێبوردەیی بە بەزەییە.

٢)- بە دڵنیایی‌و بێگومان هەر كەسێك واز لە موناقەشەو شەڕە قسە بهێنێ بە نیەتی بە دەستهێنانی خانووێكی بەهەشت، ئەم خانووەی دەست دەكەوێ.

٣)- مەبەست لەو فەرمایشتە زیاتر مسوڵمانانە كە لە نێوان خۆیان، خۆیان دوور بگرن لەوە ڕاجیاییان هەبێو تەفرەقەیان بكەوێتە نێوانو لە یەكدی توورەبن.

٤)- دەگونجێ لەگەڵ كەسێك كە بە دوای ڕاستی دەگەڕێ موناقەشە بكرێو گفتوگۆ بكرێ بە مەبەستی هیدایەت دانی‌و ڕوونكردنەوەی هەندێك بابەت كە تەم‌و مژی لەسەر

١) حسن: أخرجه أبو داود برقم: (٤٨٠٢) عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه، وحسنه الألباني.
٢) صحيح: أخرجه البخاري برقم: (٢٣٢٥) عن عائشة رضي الله عنها.

دروست کراوە لە لای ئەو، لەوبارەوەش دەقی قورئانی زۆرن، بۆ وێنە خوا بە بڕواداران دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُجَـٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... ﴿٤٦﴾ ﴾العنكبوت، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ، یان ئەی بڕواداران!) شەڕە قسە لەگەڵ خاوەنانی کتێب (واتە: جوولەکەو نەصرانی دا) مەکەن، مەگەر بە جوانترین شێوە (کە مەستتان ڕێنمایی کردنیان بێ). وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾النحل، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی بڕوادار!) بانگەواز بکە بۆ ڕێگاو ڕێبازی پەروەردگارت (بەو پەڕی) کاربەجێی و، ئامۆژگاریی جوانو ڕێك (بە ئارەزوودانە بەرەو ترساندن)، وە بە جوانترین شێوەش گفتوگۆو موجادەلە بکە.

٥)- موناقەشە بە زۆری سەرەنجامەکەی بریتیە لە دروست بوونی حەسوودیو ڕقو کینەو کێشەو ناخۆشیی، وە هەندێ جاریش گوتنی قسەی نابەجێ بە یەکدی، بۆ وێنە: جاری وایە جوێن بە یەکدی دەدرێ کە هۆی لادانو فاسیق بوونە لە دین، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ»}[1]، واتە: جوێندان بە مسوڵمان (هۆی فاسیق) بوونو دەرچوونو لادانە لە دین!

٦)- وە ئەمەش لە فەرموودەی دووەم وەردەگیرێ، کە خوای بالأدەست زۆر ڕقی لە کەسانێکە، کە هەمیشە بە دوای موناقەشە کردندا دەگەڕێن، بۆیە مسوڵمانی خۆشەویست کە ڕەخنەت لە برایەك یان خوشکێکی خۆت هەیە، پێت وایە لەو کردارەی یان لەو گوفتارەی هەڵەیە، برۆ لای بە تەنیا ئامۆژگاری بکە، جا ئەگەر لێی وەرگرتی ئەوە پاداشتت هەیە، ئەگەرنا تۆ تەنیا ڕاگەیاندنت لەسەرە بۆیە پێویست ناکات لەگەڵی بکەیە موناقەشەو شەڕە قسە.

---

١) صحيحٌ: أخرجه أحمد برقم: (٣٦٤٧)، والبخاريُّ برقم: (٤٨)، ومسلمٌ برقم: (٦٤)، والترمذيُّ برقم: (١٩٨٣)، والنسائيُّ برقم: (٤١٠٨)، وابنُ ماجهَ برقم: (٦٩).

٧)- وە هەروەها زۆر موناقەشە کردنو دەمبەدەم کردن سیفەتی ئینسانی خۆبەزلزانە، کە هەقیشی بۆ دەربکەوێ ڕەدی دەکاتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {«الْكِبْرُ: بَطَرُ الحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ»}[1]، یانی: خۆ بە گەورەزانین ئەوەیە: کە ئەو کەسە هەق ڕەد بکاتەوەو وەری نەگرێ، خەڵکیش بە نزمتر لە خۆی ببینێ.

٨)- مەبەست لەو موناقەشەی کە حەرامە ئەوەیە کە قسەی بەرانبەر ببڕیو تانەو تەشەر لە قسەکانی بدەیو سووکایەتی پێ بکەی.

٩)- واز هێنان لە موناقەشە کردن لەسەر ئەو بابەتانەی مەجالی ڕاجیایی تێدایە دەبێتە هۆی بەردەوام بوونی خۆشەویستیو یەکڕیزی تەباییو برایەتی نێوان موسوڵمانانو ڕەحمەتی خواش دەڕژێتە سەر دڵو دەروونیان.

١٠)- هەر گەلێك موناقەشەی زۆری تێدابێ بەرەو گومڕابوون دەچێ، ئەمەش دەقی فەرمایشتی لەسەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ، إِلاَّ أُوتُوا الْجَدَلَ»}[2] واتە: هیچ کۆمەڵێك گومڕانابن دوای ئەوەی هیدایەتیان وەرگرتوەو لەسەرینە، جگە لەوانەی زۆر موناقەشە کەرن (ئەوان بەرەو گومڕایی دەچن)!!

١) صحيحٌ: أخرجهُ مُسْلمٌ برقم: (٩١)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (١٩٩٩).
٢) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أحْمَد برقم: (٢٢٢١٨)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (٣٢٥٣)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ. وابْنُ ماجـهْ برقم: (٤٨)، وَالطَّبَرانيُّ برقم: (٨٠٦٧)، والحَاكِمُ برقم: (٣٦٧٤) وقَالَ: صحيح الإسْنَاد.

**پاداشت:** {«أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحاً»}[1]

واتە: من گرەنتی خانوێك دەكەم لە ناوەڕاستی بەهەشتیٚ بۆ كەسێك كە واز لە درۆكردن دەهێنیٚ ئەگەر بۆ گاڵتەشی بیٚ.

**سزا:** {«وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ وَيْلٌ لَهُ وَيْلٌ لَهُ»}[2]

واتە: سزای سەخت بۆ ئەو كەسەی قسە دەكاو درۆی (تێدا) دەكات تا خەڵك پێی پێبكەنن، سزای سەخت بۆ وی، سزای سەخت بۆ وی.

## ڕوونكردنەوە

١)- بەڵێندانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێی گرنگی پێدانە، چونكە هەر لە خۆوە قسە ناكات، خواش دەربارەی فەرمایشتەكانی فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ٤ ﴾النجم. واتە: موحەممەد لە خۆوە قسان ناكات، بەدڵنیایی ئەوەی دەیڵیٚ وەحیەو بۆی نێردراوە.

٢)- كەواتە: بە دڵنیایی هەر كەسێك واز لە نوكتە گوتن بێنیٚ بە مەبەستی بە دەستهێنانی خانووێك لە نێوەڕاستی بەهەشت، دەستی دەكەویٚ.

٣)- پێویستە خۆمان دووربگرین لە قسەی بیٚ بنەماو پووچ و بیٚ كەڵك، كە كاریگەری خراپ لەسەر كەسایەتیمان دروست بكات، چونكە ئەم جۆرە گوفتارانە دوورە لە سیفەتی ئیمانداران، لەو بارەوەش خوا فەرموویەتی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ٢ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ٣ ﴾المؤمنون، واتە: بە ڕاستی ئیمانداران (ی ڕاست و تەواو) سەركەوتوو بوون، ئەوانەی نوێژەكانیان بەوپەڕی

---

١) حَسنٌ: أَخْرَجهُ أَبو دَاوُد برقم: (٤٨٠٢) عَنْ أَبي أُمَامَة الباهلِيِّ ﷺ، وَحسَّنَهُ الألباني.

٢) حَسنٌ: أَخْرَجهُ أَبو دَاوُدَ برقم: (٤٩٩٢)، عَنْ بهْزِ بْنِ حَكِيم عَنْ أَبيه عَنْ جدِّهِ، وَحسَّنَهُ الألباني.

ملكەچییەوە ئەنجام دەدەن، وە لە گوتنی قسەی بێ سوودو پووچ خۆ دەپارێزنو پشتی تێدەكەن. كەواتە: نەك هەر قسەی بێ سوود ناكەن، بەڵكو گوێشی بۆ ڕاناگرن.

٤)- درۆ بە گشتی حەرامەو نابێ بكرێ[1]، وە بە هیچ شێوەیەك ڕێگەی پێنەدراوە هەتا ئەگەر بۆ نوكتەو گاڵتەش بێ.

٥)- پێویستە لەسەرمان جێبەجێكەری فەرمانی خوا زاڵی پایەداربین كە فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، پارێز لە خوا بكەنو لەگەڵ ڕاستگۆیان بن.

٦)- ئینسان ئەگەر چەند جارێك درۆی كرد ئیدی پێوەی ڕادێ، بۆیە مسوڵمان نابێ لە خۆی بوەشێنێتەوە بە هیچ جۆرێك درۆ بكات، بۆ ئەوەی نەبێتە خووێكو پێیەوە ڕا بێ، جگە لەمەش دەبێ هەوڵبدەین كەسایەتیمان لەكەدار نەكەین، بە كەسانی نوكتەچیو قسەی بێ بنەما نەناسرێین لە نێو خەڵك.

٧)- زۆر جار گوتنی نوكتە بووەتە هۆی كێشەو گرفتی گەورە، وە گوناهی گەورەی بە دوایی خۆی هێناوە، وەك تانەو تەشەر دان لە گەلێك، یان كۆمەڵێك، یا عەشیرەتێك، وای كردوە دوو كەس جوێن بە یەكدی بدەن، وە پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنن، تەنانەت بە دەست ئازاری یەكدی بدەن، ئەمەش هەموو سەرەنجی درۆ كردنو بوختان بۆ یەكدی هەڵبەستنە.

---

١) تەنیا لە سێ حاڵەتدا نەبێ، ئوممو كەلسومی كچی عوقبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ نەبیستووە كە ڕوخصەتی دابێ درۆ بكرێ لە هیچ كاتێك تەنیا لە سێ شتاندا نەبێ: {كَانَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ أَعدُّهُ كَاذِبًا: الرَّجُلُ يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، يَقُولُ الْقَوْلَ وَلاَ يُرِيدُ بِهِ إِلاَّ الإِصْلاَحَ، وَالرَّجُلُ يَقُولُ فِي الْحَرْبِ، وَالرَّجُلُ يُحدِّثُ امْرَأَتَهُ، وَالْمَرأَةُ تُحَدِّثُ زَوْجَهَا»} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرَقم: (٤٩٢١)، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بە درۆزن دانانرێ ئەو كەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵكی پێ چاك دەكاتەوە، وە قسەیەك دەكات كە جگە لە خێر هیچ مەبەستی دیكەی نیە، وە پیاوێك كە قسەیەك دەكات لە كاتی جەنگدا (واتە: قسەكی ناڕاست دەكات بۆ ئەوەی ورەی سوپای دوژمن بینیتە خوارێو بیانڕووخێنێ)، وە پیاوێك قسەیەك دەكات یاخود ژنێك قسەیەك بۆ پیاوەكەی دەگێڕێتەوە (بۆ ئەوەی دڵی یەكدی ڕابگرن).

٨)- ئەگەر سەرنج بدرێ سێ جار له فەرموودەکە وشەی (وَيْل) دووبارەوە بوويتەوە، ئەوەش بەڵگەی گەورەیی گوناهەکەیە، کەچی بە داخەوە لەبەر چاوی ئێمە زۆر بە ئاساییو بە سووکی تەماشای ئەم کارە قێزەوەنە دەکرێ!

٩)- ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە نابێ هەر قسەیەکمان بیست یەکسەر بڵاوی بکەینەوە، بەڵکو دەبێ تەئکیدی لێ بکەینەوە، ئایا ڕاستە یان درۆ، خوای دادگەریش لەم بارەوە ئاگاداری کردووینەوەو فەرموویەتی: ﴿إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ ۝٦﴾الحجرات، واتە: ئەگەر کەسێکی لادەرو فاسیق هەواڵێکی بۆ هێنان، لێی بکۆڵنەوەو تەئکید بکەنەوە له ڕاستیەتی هەواڵەکەی (و یەکسەر بڵاوی مەکەنەوە).

١٠)- نوکتە گوتن زیاتر بە مانای گاڵتە پێکردن دێ، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، تۆ کە نوکتە لەسەر عەشیرەتێك دەڵێی گاڵتەی پێدەکەی، وا باشە بیر لە ئایەتی: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١﴾الهمزة، بکەیەوە، ئیبنو تەیمیە دەڵێ: (هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ) واتە: (الطَّعَّان العيَّاب)[1]. ئەوانەی زۆر تانە لە خەڵك دەدەنو زۆر عەیبو کەمو کوڕیان لێ دەبیننەوە، وە جیاوازی نێوان ئەم (هُمَزَةٍ) و (لُّمَزَةٍ) ئەوەیە، (هُمَزَةٍ) تانە دانە لە خەڵك بە کردەوە، بۆ نموونە کە قسان دەکات تۆ پەنجە لە گوێت بدەی، مانای وایە قسەکەی درۆیە! یان بە جوولەی دەستت دانیشتوانی تێبگەیەنی ئەم کەسە خراپە.. هتد، بەڵام (لُّمَزَةٍ) ئەوەیە بە زمان عەیبی لێ ببینیەوە، وەك لە نێو خۆمان باوە کە دەگوترێ سوورچیەك وای کرد، خۆشناوێك وای گوت، سەیر لەوە دایە ئەوەی قسەکە دەکات، دڵنیاشە لەوەی کە ئەم قسەی دەیکات، نوکتەیە درۆیەو بە ناوی ئەم عەشیرەتانەوە دەیکات، ئاخر کاکە بۆ لە خۆت دەوەشێنیەوە درۆیان بکەی، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (درۆ دوژمنی خوایە)، ئنجا بەڕاستی وایە خوا زۆر ڕقی لە درۆیە، وەك لە زۆر شوێنی قورئان فەرموویەتی.

---

١) مجموع الفتاوى: ج٤، ص٤٥٥

پاشان بزانه گاڵته له‌گه‌ڵ کردن جیاوازه له گه‌ڵ نوکته گوتن، با نموونه‌یه‌ك بێنینه‌وه له‌سه‌ر جیاوازی نێوان گاڵته پێکردن‌و گاڵته له‌گه‌ڵ کردن:

پێشه‌وا( (قُرطُبي) ده‌ڵێ: ((کابرایه‌ك که زوڵمی لێ ده‌کرێ زۆر به تووڕه‌یی ده‌چێته مه‌حکه‌مه‌و له لای قازییه‌کی ناوداری مسوڵمانان گله‌یی خۆی ده‌کات‌و داوای مافی خۆی ده‌کات، (قازیش ده‌یه‌وێ هێمنی بکاته‌وه) بۆیه له کابرای ده‌پرسێ: ئه‌رێ کاکه ئه‌و عه‌بایه‌ی که له‌به‌رتدایه له تووکی به‌رانه، یاخود له تووکی مه‌ڕه؟ کابراش ده‌ڵێ: جه‌نابی قازی گاڵته‌م پێ مه‌که‌و له نه‌زانان مه‌به! قازییه‌که‌ش ده‌ڵێ: نا گاڵته‌ت پێناکه‌م، گاڵته‌ت له‌گه‌ڵ ده‌که‌م!! قسه‌ی خۆش له‌گه‌ڵ کردن جیایه، له‌گه‌ڵ کردنی قسه‌ك که بێ بنه‌مایه!!

**پاداشت:** {«**مَنْ حَفِظَ مَا بَيْنَ لِحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ**»}[1]
واتە: هەر کەسێك ئەو شتەی لە نێوان هەردوو شەویلگەی دایە (واتە: زمان)و ئەوەی لە نێوان هەردوو ڕانی دایە (واتە: عەوڕەت) بپارێزێ (لە حەڕام) دەچێتە بەهەشت.
**سزا:** {«**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ لا يَرَى بِهَا بَأْساً يَهْوِي بِهَا سَبْعِينَ خَرِيفًا فِي النَّارِ**»}[2]
واتە: بەڕاستی جاری وایە پیاوێك (یان ئافرەتێك) بە یەك وشە قسەیەك دەکات، وە پێشی وایە قسەیەکی زۆر ئاساییەو (هیچ حیسابێکی بۆ ناکات) کەچی بە هۆی ئەو وشەوە (کە لە زاری دەرچووە) حەفتا ساڵ دەخرێتە ناو ئاگر (ی دۆزەخەوە).

## ڕوونکردنەوە

١)- بیر کردنەوە لەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێی بیر لێکردنەوەیەکی زۆر وردە، چونکە پاراستی زمانو بەکارنەهێنانی لە قسەی خراپ یەکسانە بە چوونە بەهەشت!
٢)- کەواتە: بە دڵنیایی هەر کەسێك خەڵك لە زمانو داوێنی پارێزراوبێ‌و نیەتیشی لەوەدا (ئەو دوو ئەندامەی خۆی سەلامەت ڕابگرێ) بە دەستهێنانی بەهەشت بێ دەستی دەکەوێ‌و دەچێتە نێوی إن شاءالله، بە تایبەتی زمان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**أَكْثَرُ خَطَايَا ابْنِ آدَمَ فِي لِسَانِهِ**»}[3] واتە: زۆربەی گوناهو هەڵەکانی وەچەی ئادەم بە هۆی زمانیەوەیە.
٣)- مەبەست لە پاراستنی زمان بریتیە لە نەخواردنی ماڵی حەڕام بە هەموو جۆرەکانیەوە (وەك: ڕیبا، دزیی، دەستبەسەرداگرتن..)، غەیبەت نەکردن، قسەی ناشیرینو خراپ نەکردن، بوهتان هەڵنەبەستن، وە هەروەها نەهێنانو نەبردنی قسە لە نێوان خەڵك بۆ دروست کردنی ئاشووب لە نێوانیان.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٨٠٥٨) عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، وقَالَ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٢١٤)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط.
٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (١٤٤٦) قَالَ الهَيْثَمِيُّ: رجالهُ رجال الصَّحِيح، وأَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ فِي "شُعَب الإِيمَان" برقم: (٤٩٣٣) وَصَحَّحَهُ الألباني.

٤)- مه‌به‌ست له پاراستنی عه‌وره‌ت بریتیه له خۆ دوورگرتن له زینا، ئه‌ویش به خۆ دوورگرتن له پێشه‌کیه‌کانی زینا، که (أحمد شه‌وقی) له دێره شیعرێکدا ڕوونی کردۆته‌وه:

نَظْـرَةٌ فَابْتِسَامَـةٌ فَسَلامٌ      فَكَلامٌ فَمَوْعِدٌ فَلِقَاءٌ

واته: ته‌ماشا کردنێکه، دوایی زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌که، پاشان سه‌لام کردنێکه، ئنجا قسه‌کردنێکه، دوای جێی ژوان دانانێکه، سه‌ره‌نجام پێك گه‌یشتنه.

٥)- زۆربه‌ی گوناهه‌کان که تووشی ئینسان ده‌بێ به هۆی زمانیان‌و داوێنیانه‌وه‌یه، وه‌ك له‌م فه‌رمووده ڕوونکراوه‌ته‌وه، {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ فَقَالَ: «تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ»، وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ؟ فَقَالَ: «الْفَمُ وَالْفَرْجُ»}[1]، واته: ئه‌بو هوره‌یره خوا لێ ڕازی بێ ده‌ڵێ: پرسیار له پێغه‌مبه‌ر ﷺ کرا له باشترین شتێك که زۆرترینی خه‌ڵکی ده‌خاته به‌هه‌شته‌وه؟ فه‌رمووی: پارێزکاریی و ڕه‌وشتی جوانه، وه پرسیاری لێکرا له‌وه که چ شتێك زۆرترینی خه‌ڵکی ده‌خاته دۆزه‌خ؟ فه‌رمووی: زارو داوێن، واته: ئه‌و گوناهانه‌ی که به‌ده‌م ده‌کرێن، وه‌ك درۆو بوختان‌و غه‌یبه‌ت‌و شیرك‌و کوفرو ئه‌وانه، وه داوێن که دیاره داوێن پیسیی‌و زینای پێ ده‌کرێ.

٦)- له فه‌رمووده‌ی دووه‌م وه‌رده‌گیرێ که جاری وایه ئینسان به یه‌ك وشه که له زاری ده‌رده‌چێ تووشی کوفر ده‌بێ، وه پێویسته دووباره شایه‌تمانێکی نوێ بێنێته‌وه، ئه‌گه‌رنا ڕه‌نگه له‌سه‌ر ئه‌و وشه‌یه بمرێ (بۆ وێنه: یه‌کێك شیرك بۆ خوا بڕیار ده‌دات، یان کوفرێك ده‌کات له کاتی تووڕه بوون، یان هه‌ر شتێکی دی وێنه‌ی ئه‌وانه)، یان وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رموێ: {«إِذَا قَالَ الرَّجُلُ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ»}[2]، واته: ئه‌گه‌ر پیاوێك گوتی: خه‌ڵك هه‌موو خراپن‌و له نێو چوون، ئه‌وه بۆ خۆی له هه‌موویان خراپتره‌و له نێو چووه.

---

١) حسنٌ: أخرجهُ أحمدُ برقم: (٩٦٩٤)، والبخاريُّ في "الأدب المفرد" برقم: (٢٩٤)، والترمذيُّ برقم: (٢٠٠٤) وقال: حديثٌ صحيحٌ غريبٌ، والحاكمُ برقم: (٧٩١٩) وقال: صحيح الإسناد، وابنُ حبَّان برقم: (٤٧٦)، وابنُ ماجة برقم: (٤٢٤٦)، وحسَّنهُ الألباني في "الصحيحة" برقم: (٩٧٧)

٢) صحيحٌ: أخرجهُ مالك برقم: (١٧٧٨)، وأحمد برقم: (١٠٠٠٦)، والبخاريُّ في "الأدب المفرد" برقم: (٧٥٩)، ومُسلمٌ برقم: (٢٦٢٣)، وأبو داوُد برقم: (٤٩٨٣)، وابنُ حبَّان برقم: (٥٧٦٢).

جا ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بمرێ لەسەر ئەو حاڵەش زیندوو دەكرێتەوە، لەوبارەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: { «**يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ**» }[1]، یانی: هەموو بەندەیەك لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەكرێتەوە كە لەسەر مردووە.

٧)- پێویستە زۆر ئاگاداری هەر وشەیەك بین كە لە زارمان دێتە دەرو بە هەندی وەربگرین، چونكە وشە هەیە لە لای ئێمە زۆر بچووكەو ڕەنگە پێمان وابێ هەر زۆر ئاساییە، كەچی حەفتا ساڵ بە هۆیەوە دەخرێینە ناو دۆزەخەوە، وە لەوبارەوەش خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾﴾النور. واتە: هەندێك قسان دەكەن دەربارەی هەندێك شتان بەبێ ئەوەی زانیاریتان لەسەری هەبێ، وە پێشتان وایە شتێكی زۆر ئاساییو بچووكەو هیچ حیسابێكی بۆ ناكەن، بەڵام لە لای خوا زۆر گەورەیە. بۆ وێنە: جاری وایە كەسێك بوختانێك دەكاتو لە لاشی زۆر ئاساییە، كەچی خوا سزای دنیایی بۆ داناوە پێش قیامەت، یانی: ئەگەر كەسێك بوختانێكی كرد ئەمە سزایەكەیەتی:

أ/ شایستەی لێدانی هەشتا قامچی دەسەڵاتی شەرعیی دەبێ (ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی هەبێ).

ب/ مۆری فاسیقیەتی پێ دەبەخشرێو بە نێوەچەوانیەوە هەڵدەواسرێ!!!

ج/ شایەدی لێوەرناگیرێ، لەبەر ئەوەی بە درۆزن دادەنرێ.

٨)- كاتێك دەمانەوێ قسەیەك بكەین، سەرەتا دەبێ بیری لێ بكەینەوە، ئەگەر زیانی نەبوو، واتە: گوناحو تاوان نەبوو بیكەین، ئەگەرنا دەبێ بێدەنگ بین، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: { «**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً، أَوْ لِيَصْمُتْ**» }[2] واتە: هەر كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بكات یان بێدەنگ بێ و قسەنەكات.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ عَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١٠١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٧٨)، وَإِبْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٧٣١٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٦٨٨).

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٨٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٢).

٩)- جاری وایە بە هۆی قسەیەك كە نەقڵی دەكەی لە یەكێكی دیكەوە تووشی گوناح دەبی، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ**»}[1]،
واتە: بەسە ئینسان گوناهباربێ كاتێك هەر قسەیەك دەبیستێ دەیگێڕێتەوە!!
١٠)- پێویستە لەسەرمان داوێنی خۆمان پاك ڕابگرین، چونكە ئەوەندە بەسە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**يَا شَبَابَ قُرَيْشٍ! لاَ تَزْنُوا، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، أَلاَ مَنْ حَفِظَ فَرْجَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ**»}[2] واتە: ئەی گەنجانو لاوانی قوڕەیش! زینا مەكەنو داوێنی خۆتان بپارێزن، چونكە هەر كەسێك داوێنی خۆی لە حەرام بپارێزێ دەچێتە بەهەشتەوە،
مسوڵمانی خۆشەویست!
هەرچەندە ڕووی دواندنو قسە كردن لە گەنجانو لاوانی قوڕەیشە، بەڵام بە دڵنیایی هەموو گەنجو لاوێك دەگرێتەوە لە هەر شوێنێكی دنیاو لە هەر هۆزو گەلێك بێ بە مەرجێك مسوڵمان بێ، كە بێگومان ئەوەش هاندانێكی دیكەیە بۆ خۆ دوورگرتنمان لەو گوناهە گەورەو ناقوولایە!
دیارە ئێمە ئەگەر لەبەر پاداشتەكەش واز لەو گوناهە نەهێنین، دەبێ لەبەر سزایەكەی وازی لێبێنین، چونكە دەربارەی زینا كردن خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ... ﴿٢﴾ ﴾النور، واتە: ئافرەتی زیناكەرو پیاوی زیناكەر هەر یەكی سەد قامچیان لێ بدەن، ئەوە دیارە ئەگەر كوڕبنو ژنیان نەهێنابێو كچ بنو شوویان نەكردبێ، ئنجا لە فەرمایشتێكی دیكە فەرموویەتی: {«**لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ**»}[3]، واتە: كەسی زیناكەر لە كاتی زینا كردن ئیمانی لە جەستە نامێنێ، هەتا واز لە زیناكە دێنێ، ئەو بەڕاستی هەڕەشەیەكی زۆر

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٤٩٩٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٠)، قال شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صحيحٌ.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٤٧٢٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني، وَقَالَ الهَيْثَمِيّ رجاله رجال الصَّحِيح.
٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٢٥٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١١).

گه‌وره‌ی تێدایه‌، چونكه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: {«**يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ**»}[1]، واته‌: هه‌موو به‌نده‌یه‌ك له‌سه‌ر ئه‌و حاڵه‌ته‌ زینـدوو ده‌كرێتـه‌وه‌ كـه‌ له‌سه‌ر مردووه‌، كه‌واته‌: ئه‌گه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ له‌و كاته‌ بمرێ به‌بێ نیمانی ده‌مرێ‌و هیچ پاساوو به‌ڵگه‌یشی نیه‌ بۆ ڕزگار بوون، خوا په‌نامان بدات‌و بمانپارێزێ.

١) صحيحٌ: أخرجه عبدُ بن حميد برقم: (١٠١٣)، ومسلمٌ برقم: (٢٨٧٨)، وابنُ حبّان برقم: (٧٣١٩)، والحاكمُ برقم: (٣٦٨٨).

**پاداشت:** {**«مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ سَتَرَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»**}[١].
واتە: هەر کەسێك کەمو کوڕیی‌و عەیبی برای مسولّمانی خۆی داپۆشێ (لە دنیادا)، خوا لە ڕۆژی دوایی دا کەمو کوڕیی‌و عەیبەکانی ئەو دادەپۆشێ.
**سزا:** {**«مَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ كَشَفَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ»**}[٢].
واتە: هەر کەسێك کەمو کوڕیی‌و عەیبی برای مسولّمانی خۆی ئاشکرا بکات (لە دنیادا)، خوای (تۆڵەسێن) کەمو کوڕیی‌و عەیبەکانی ئەو ئاشکرا دەکات، هەتا بەو هۆیەوە ڕیسواو (سەرشۆڕی) دەکات ئەگەر لە نێو ماڵەکەی خۆیشی دابێ.

## ڕوونکردنەوە

١)- پێویستە لەسەر مسولّمان بە هەموو شێوەیەك عەیبی برای خۆی داپۆشێ، جا ئەگەر گوناهێکە کردوویەتی، یان لە کاتی جل پێدان جەستەی بینیوە عەیبێکی هەبووە، یان گومانێکی لەسەرە لێی دوور دەخاتەوەو پاساوی بۆ دێنێتەوە..هتد، (مەگەر حاڵەتێکی تایبەت کە زیانی بۆ ئاین هەبێ).
٢)- ئاشکرا نەکردنی عەیبی خەڵکی نیشانەی بەرزی پلەی ئیمانە، چونکە کەس حەز ناکات عەیبەکانی ئاشکرا بکرێ، مادام وابێ دەبێ پێشمان ناخۆش بێ عەیبی مسولّمانێك ئاشکرا بکەین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**«لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»**}[٣]، واتە: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ برای مسولّمانیشی پێی خۆش نەبێ.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٤٦) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، وَصحَّحَهُ الألباني.
٢) صَحِيحٌ: المصدر نفسه.
٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٩٠١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥١٥) وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠١٦)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٦).

٣)- ئەگەر لە دنیادا عەیبی مسوڵمانانت ئاشکرا نەکرد، لە ڕۆژێکدا عەیبەکانت دادەپۆشرێ‌و ئاشکرا ناکرێ کە هەموو نهێنیەکان ئاشکرا دەکرێن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ ﴾الطارق، واتە: ئەو ڕۆژە نهێنیەکان (واتە: کردارو گوفتارە چاك‌و خراپەکانی ئینسان) ئاشکرا دەکرێ‌و خەڵك دەیبینێ!

٤)- دەبێ بیرکردنەوەمان لە عەیبەکانی خۆمان وامان لێ بکات، بواری ئەوەمان نەبێ بە دوای عەیبی خەڵکی دا بگەڕێین، ئەگەرنا ئەو فەرمایشتەمان لەسەر جێبەجێ دەبێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«يُبْصِرُ أَحَدُكُمُ الْقَذَاةَ فِي عَيْنِ أَخِيهِ، وَيَنْسَى الْجِذْعَ فِي عَيْنِهِ»}[1]، واتە: یەکێك لە ئێوە پوشکەی لە چاوی برای خۆی دەبینێ، بەڵام کاریتەی لە نێو چاوی خۆی نابینێ.

٥)- تاوانەکە هێندە گەورەیە جگە لە هەڕەشەی دوارۆژو قیامەت، هەڕەشەی دنیاییشی لەسەرە.

٦)- جا ئەگەر لە ڕووی ئینسانیشەوە تەماشای ئەم دەقە بکەین‌و پرسیارێك بکەین: ئایا کەسێ کە نەخۆشبێ دەبێ نەخۆشیەکەی بۆ زیاد بکەی؟!! یان کەسێك لە ڕێگا دەڕوات‌و دەکەوێتە نێو چاڵێکەوە دەبێ تۆش خۆڵی بەسەردا بکەی‌و یەکجاری لە ناوی ببەی؟!! یاخود دەبێ دووعا بۆ نەخۆشەکە بکەی‌و داوای شیفای بۆ بکەی‌و هاوکاری بکەی؟! وە ئەو کەسەش کە کەوتۆتە چاڵەوە دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکەی‌و ڕزگاری دەکەی؟! وەڵامەکەی بۆ تۆی خۆشەویست بەجێ دێڵم.

٧)- بە ڕاستی ئەگەر چەند جارێك ئەو فەرموودانە بخوێنینەوەو، بیریان لێ بکەینەوەو، هەڵوەستەیان لەبەردەم بکەین، دەگەینە ئەو ئەنجامە کە مسوڵمان دەبێ زۆر وریابێ زۆر خۆی دوور بگرێ لەوەی خەریکی بە دواکەوتن‌و ئاشکرا کردنی عەیبی خەڵکی مسوڵمان بێ، ئەگەر لە کردارێکیشی ڕازی نەبوو نابێ، ڕیسوای بکات‌و بڵاوی بکاتەوەو ناشیرینی بکات لە نێو خەڵك.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ بِرَقْم: (٥٧٦١)، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي.

٨)- بە جێبەجێکردنی فەرمایشتی یەکەم ڕزگارت دەبێ لە یەکێك لە گوناهە گەورەکان، ئەویش غەیبەت کردنە، دەتوانم بڵێم کوشندەترین دەردو نەخۆشی ئەمڕۆی نێو کۆمەڵگەی مسوڵمانان بریتیە لە غەیبەت کردن، کە وەك گوتم هەر تەنیا بیرکردنەوەمان لە پاداشتی ئەم فەرمودە دەبێ وامان لێ بکات ئامادەیی ئەوەمان تێدا نەبێ باسی خەڵکی بکەین، بە شێوەیەك کە لەسەری گوناهبارین.

٩)- بیرکردنەوەمان لە چەند ئایەتێك کە وامان لێدەکەن بە هیچ جۆرێك[1] ئامادەیی ئەوەمان تێدانەبێ، باسی عەیبی خوشكو برای مسوڵمانی خۆمان بکەین:

خوای گەورە، بینەری گوناهی گچکەو گەورە، زاناو شارەزا بە عەیبی گشت بەندەکان لە چەند شوێنێك باسی چاودێری خۆیو مەلائیکەتە بەڕێزەکانیمان بۆ دەکات تاکو بە هۆیانەوە خۆمان بگرینەوە لە گوناه کردن، بە تایبەتی ئاشکرا نەکردنی عەیبی خەڵك، بۆ وێنە:

أ/ خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾النساء. واتە: بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە، یان لە شوێنی دی فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠ ﴾آل عمران، واتە: وە خوا بینایە بە بەندەکانی، دەیانبینی (لە کاتێك هەر کردارێك یان گوفتارێك ئەنجام دەدەن)، جا هەست کردنمان بەوەی خوا دەمانبینێ بەسە بۆ ئەوەی ئەمادەیی ئەنجامدانی گوناهمان تێدانەبێ.

دوایی تەماشا دەکەین لە شوێنی دیی باسی هینانە بەرچاوی کردەوەکانمان دەکات، وەك ئەوەی کردەوەکانمان لە ڕۆژی دوایی شایەدیمان لەسەر بدە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٩ ﴾الجاثیة. واتە: ئێمە نوسخە بەرداریمان لێکرد، فۆتۆکۆپییمان دەکرد ئەو (کردارو گوفتارانەی) ئێوە دەتانکرد.

---

١) مەگەر لە حاڵەتی پێویست، بۆ وێنە: کە پرسیارت لێ دەکرێ دەربارەی کەسێك بە بۆنەی زەواج، یان شەریکاتیو مامەڵە لەگەڵ کردن، یان لە بەردەم دادگای سکاڵا لەسەر تەرەفی بەرانبەرت تۆمار دەکەی... هتد، هەندێ حاڵەتی دیکە کە زانایان ڕێگەیان پێداوە باسی حەقیقەتی ئەو کەسە بکرێ، گوناهی لەسەر نیە.

کەواتە: کردەوەکانمان فۆتۆکۆپی دەکرێن، دیارە ئەگەر ئینسان بتوانێ بە کامێرای ڤیدیۆ شت فۆتۆکۆپی بکات، دەبێ فریشتەکان کە خوا بەسەر ئێمەوە کردوونیە چاودێر، چ ئامێرێکی گەشەسەندوویان پێبێ کە هەموو کردەوەو حەرەکەو سەکەنەی ئێمە تۆمار بکەن!!

ب/ وە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ﴿١٦٧﴾﴾البقرة، واتە: ئاوا خوا کردەوەکانیان پێشان دەدات، بۆ ئەوەی بۆیان ببێتە مایەی غەمو پەژارەوە.
ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە قیامەتێ خوا کردەوەکان بۆ ئینسان بەرجەستە دەکات، چاك بن یان خراپ، کردەوەکانی بەبەرجەستە کراویی دەبینێ، ئەم مەسەلەیەش ئیعجازێکی زانستی تێدایە، چونکە لە سەردەمێك دا کە قورئان هاتۆتە خوارێ کەس نەیزانیوە کردەوەکان چۆن ڕۆژی دوایی بەرجەستە دەکرێنەوە؟ بەلآم ئێستا هەر قسەو کردارێك بویسترێ تۆمار بکرێ، بە کامێرای ڤیدیۆ دەگیرێ، دوایی دەڵێن ئەوە تۆنی؟ ناتوانی بڵێی نا، وەك دەزگا هەواڵگریی‌و جاسوسییەکان بەکاری دێنن، کامێرای شێراوە دادەنێن هەموو حەرەکەو سەکەنەی ئەو کەسە تۆمار دەکرێ‌و دوایی کە حاشای کرد، دەڵێن: ئا ئەوە تۆ نی؟! بێگومان ناتوانی ئینکاریی‌و نکوولیی لێ بکەی[1]

ج/ وە فەرموویەتی: ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾﴾الجاثية، واتە: ئەوەی کردبوویان ئامادەبوو، بە ئامادەیی بینییان، یانی خوا بۆمان تەصویر دەکات، وەك ئەوەی ڕوویدابێ‌و ئەویش بۆمان بگێڕێتەوە.
د/ ئەنجا خوای پەروەردگار چونکە کاربەجێیە، زانایە بە بەندەکانی، دەبینین زۆر بە وردی لەگەڵی دێ باسی چاودێری فریشتەکانی بۆ دەکات، وەك ئەوەی پێی بفەرموێ: ئەی بەندەکەم ئەگەر هەمیشە هەستت بە چاودێری منیش نەکرد، ئەوە بزانە دوو فریشتە هەن لەسەر شانی ڕاستو چەپتان هەموو کردارو گوفتارەکتان دەنووسن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾﴾الانفطار، واتە:

---

١) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، تەفسیری ئایەتی (١٦٧) سوورەتی بەقەرە.

بێگومان دوو (فریشته‌ی) پارێزه‌رتان له‌سه‌ر هه‌ن، دوو نووسه‌ری به‌ڕێزن، ئه‌وه‌ی ئێوه ئه‌نجامی ده‌ده‌ن (له کردارو گوفتار) ئه‌وان ده‌یزانن. ئه‌دی له کوێ باسی ئه‌وه ده‌كات ده‌ینووسن، له سووره‌تی (ق) وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾.

واته: كاتێك ئه‌و دوو مه‌لائیكه‌ته‌ی كرداره‌كان ده‌نووسن، كه له لای ڕاستو له لای چه‌په‌وه دانیشتوون، (هی ڕاست كرده‌وه باشه‌كان ده‌نووسێ، هی چه‌پ، كرده‌وه خراپه‌كان ده‌نووسێ). وه هیچ قسه‌یه‌ك نیه له ده‌م ده‌رچێ چاودێرێكی به‌سه‌ره‌وه‌یه (و ده‌ینووسێ، جا ئه‌گه‌ر قسه‌ش نه‌بێ به ئاماژه‌و هێماو ڕه‌مزیش بێ ئه‌وان هه‌ر ده‌ینووسن).

جا داواكارم ئه‌و چه‌ند ئایه‌ته ببێته هۆكاری به خۆداچوونه‌وه‌و تۆبه كردنێكی یه‌كجاره‌كیی‌و په‌شێمان بوونه‌وه له‌وه كه تا ئێستا باسی عه‌یبی هه‌ر براو خوشكێكی خۆمانمان كردبێ به نه‌زانی‌و بێ ئاگایی له حوكمی ئه‌و گوناهه.

١٠)- ماوه بڵێم ئه‌وه‌نده به‌سه واز له‌وه بێنین باسیی كه‌م‌وكوڕیی‌و عه‌یبی خه‌ڵكی بكه‌ین، له كاتێكدا خوای زاڵی پایه‌دار به‌و هه‌موو ڕێزو گه‌وره‌ییه‌ی خۆیه‌وه هه‌ڕه‌شه‌ی ئه‌وه‌مان لێده‌كات كه ڕیسواو شه‌رمه‌زارمان ده‌كات ئه‌گه‌ر باسی عه‌یبی خه‌ڵكی بكه‌ین، جا ئایا كێ قسه‌ی له قسه‌ی خوا ڕاستتره؟! بێگومان كه‌س، وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾، واته: ئایا قسه‌ی كێ له هی خوا ڕاستره؟!!

كه‌واته: ده‌بێ دڵنیابین ئه‌گه‌ر ئێمه عه‌یبی خه‌ڵكی باس بكه‌ین بۆ ئه‌وه‌ی ڕیسوایان بكه‌ین، خوای په‌روه‌ردگار له تۆڵه‌ی وانو بۆ هێنانه دی ڕاستی قسه‌ی خۆی ڕیسوامان ده‌كاو عه‌یبه‌كانمان ئاشكرا ده‌كات. وه به پێچه‌وانه‌وه پاداشتێكی زۆر گه‌وره‌شت هه‌یه ئه‌گه‌ر ڕێگه نه‌ده‌ی باسی عه‌یبی هه‌ر مسوڵمانێك بكرێ، ئه‌وه‌تا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: {«مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ بِالْغَيْبِ، رَدَّ اللَّهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[1]، واته: هه‌ر كه‌سێك ڕێگه نه‌دات باسی ناموس‌و عه‌یبی برای مسوڵمانی

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيُّ بِرقم: (١٩٣١)، وَصَحَّحَهُ الألباني.

خۆی بکرێ لە پاشملە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا دەموچاوی دەپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ.

خۆ من عەیبم گەلێ زۆرن ناتوانم سەرژمێریان کەم

تاکو ساتێ دابنیشم سەرکۆنەی خۆمیان پێ بکەم

جا من کەی کاتێکم ماوە باسی عەیبی خەڵك بکەم

گەر پیاوم با لەجێی خەڵکی چارەی عەیبەکانم بکەم

جا کە کاتم نەبێ بۆ خۆم بەینم لەگەڵ خوادا چاك کەم

ئیدی ئەوە سەرشێتیە زیاتر بەینی خۆمان تێکدەم

بۆیە دێنمەوە بیری خۆم فەرموودەی خۆشەویستی خۆم

پێی فەرموومە بپارێزم گشت عەیبی خەڵك لە لای خۆم

لە فەرمایشتی صەحیح دا نەصیحەتمانی فەرمووە

بێجگە لەوەی کە باسم کرد ئەم فەرموودەشی فەرمووە

پوشکەی نێو چاوی خەڵکی لە چاوتان وەك تەختە دارە

تەختەی نێو چاوتان لەپێش چاوانتان وەك پووشکە دارە

**پاداشت:** {«ارْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ، يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ»}[١]

واتە: ئێوە بەزەییتان بێتەوە بە ئەوانەی لەسەر زەوین (بە ئینسانو ئاژەڵەوە)، ئەوەی کە لە ئاسمانە بەزەیی پێتاندا دێتەوە (واتە: خوای بەبەزەیی!!).

**سـزا:** {«مَنْ لَمْ يَرْحَمْ النَّاسَ لَمْ يَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»}[٢]

واتە: هەر کەسێك بەزەیی نێتەوە بە خەڵکی، خوای عزَّ وجلَّ بەزەیی پێی نایێتەوە.

## ڕوونکردنەوە

١)- بەبەزەیی بوونمان لە نێوان خۆماندا پێویستە، چونکە لە فەرمایشتی یەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەی فەرمان فەرموویەتی، واتە: ئێمە سەرپشك نین لەوە ئایا بەبەزەیی بین، یان نا؟! بۆچی؟ چونکە وەك گوتمان فەرمانی بێ چەندو چوونو ڕوونو ڕاشکاوی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە.

٢)- هەر کاتێك ئێمە بەزەییمان بێتەوە بە خەڵك، ئەوە خوای بەبەزیی‌و بەخشندە، ئەوپەڕی بەزەیی‌و بەخشندەی هەیە لێمان خۆشدەبێ‌و بەزەیی پێمان دێتەوەو بەردەوام دەمانبوورێ، چونکە دوو لە سیفەتەکانی بریتین لە (غفور ورحیم)، بۆیە دەبینین کە لەگەڵ گوناهباران دەدوێ، پێیان دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ ﴾المائدة، واتە: ئایا هەر ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبوردنیشی لێناکەن؟! لە حاڵێکدا کە خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە! بە ڕاستی ئینسان سەری سوورِدەمێنێ لەو هەموو نەرمو نیانی‌و ڕەحمەتو بەزەیی‌و لێخۆشبوونەی خوای بەبەزەیی، سبحان الله! خوا چەند هێدیی‌و مەندە، چەند بەخشندەیە، چەند بەبەزەیی یە، چەند لێبووردەیە!!

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ أبو داوُدَ: (٤٩٤١)، وصَحَّحهُ الألباني في "الصَحيحَة": (٩٢٥)

٢) صحيحٌ: أخرجهُ أحْمَدبرقم: (١٩١٨٧) وقال شعيب الأرنؤوط: إسْنادُهُ صَحيحٌ عَلى شرْطِ الشَّيْخين.

ئایا ئەگەر ئێمەش خۆمان بە خاوەنی ئەم پەیامە دەزانین کە خاوەنەکەی ئەوە سیفەتیەتی، ئەدی نابێ هەر تۆزێك یان بە قەدەرو لە قەدەر خۆمان ئەو سیفەتی بەزەییەمان تێدا ڕەنگ بداتەوە؟

چونکە ئەوە خوا لەگەڵ کەسانێکی سپڵەو بێ منەتو ناسوپاسگوزار کە بەردەوام لە سەرپێچی کردنی دا بوونە بەو شێوەیە دواوە، وەك یەکێك بە یەکێکی دیکە بڵێ: ئەرێ کاکە نایێی میوان بی، لەلامان نان بخۆی؟! خوا ئاوا بەو شێوە سۆزو بەزەییەوە خەڵکی گوناهکار دەدوێنێ، دەبێ ئێمەش ئەو سیفەتە بە پێی توانا لە خۆماندا بەرجەستە بکەین، تاکو خواش ئەو سیفەتەی خۆی بەرانبەرمان جێبەجێ بکات.

٣)- لە فەرموودەکە وشەی (**أَهْلَ الأَرْضِ**) بەکارهاتووە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە دەبێ بەرانبەر هەموو دروست کراوەکانی سەر زەوی بەبەزەیی بین، جا ئینسانە، ئاژەڵە، باڵندەیە... هتد.

٤)- مەلائیکەتەکان بە شێوەی بەزەیی پێداهاتنەوەمان دووعای خێرو لێخۆش بوونمان بۆ دەکەن، چونکە ئەوانیش بە ئەهلی ئاسمان دادەنرێن، بۆیە دەبینین خوای پەروەردگار دەربارەی مەلائیکەتەکان کە دووعا بۆ ئیمانداران دەکەن فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ۝٧ ﴾غافر،

کەواتە: فریشتەکانی دەوری عەرشی خوا دووعا بۆ ئەو ئیماندارانە دەکەن کە هەمیشە تەوبە دەکەنو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

٥)- مادام وابێ، زوڵمو ستەم بە هیچ جۆرێك ڕێگەی پێنەدراوە، وەك خوای پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسی دا فەرموویەتی: {«**يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً**»}[1] واتە: ئەی بەندەکانی من، ستەمکاریم لەسەر

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٧٣٧)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٦١٩)، وَالبَزَّارَ برقم: (٤٠٥٣).

خۆم قەدەغە کردوە، وە هەروەها لە نێوان ئێوەش دا قەدەغەم کردوە، بۆیە ئێوەش ستەم لە یەکدی مەکەن.

٦)- بە ڕاستی گرنگیی و گەورەیی و خۆشەویستی سیفەتی بەزەیی لەلایەن خوا لەوە بەدەردەکەوێ کە خوای پەروەردگار لەگەڵ ئەوەی سەدان سیفەتی بەرزو پەسندی هەن، بەلاّم لە سەرەتای هەموو سوورەتەکان، جگە لە سوورەتی تەوبە، کە ئەویشی لە سوورەتی ئەمل قەرەبوو کردۆتەوە، بە سیفەتی بەزەیی خۆی دەستی پێکردوە، دەفەرموێ: (**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**)!

٧)- لە خاڵی شەشەم وەردەگیرێ دەبێ ئێمەش سیفەتی بەزەیی پێش هەموو سیفەتەکانی دیکە لە خۆماندا بەرجەستە بکەین، هەوڵبدەین ڕەنگدانەوەی تەواوی هەبێ لە هەموو ژیانماندا.

٨)- پێغەمبەری خوا ﷺ چوونە بەهەشتی پەیوەست کردوە بە هەبوونی سیفەتی بەزەیی بوون بەرانبەر هەموو خەلکی، لەوبارەوەش ئەم دەقە هەیە: {**عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تَرَاحَمُوا» قَالُوا: كُلُّنَا رَحِيمٌ، قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ رَحْمَةُ أَحَدِكُمْ أَصْحَابَهُ وَلَكِنَّهَا رَحْمَةُ الْعَامَّةِ»**}[1] واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشتێ هەتا بەبەزەیی نەبن، گوتمان: ئێمە هەموومان بەبەزەیین، فەرمووی: ئەوەنا کە یەکێکتان بەرانبەر هاوەڵەکەی بەبەزەیی بێ، بەڵکو بەبەزەیی بوون ئەوەیە بەرانبەر هەموو خەڵکێك بەبەزەیی بی.

٩)- ئەگەر ئێمە خوامان خۆشبوێ دەبێ شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری خوا ﷺ بین، ئێ کەسیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەبەزەیی تر نەبووە، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ

---

١) صحيحٌ: أخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٧٣١٠) تعليق الذهبي في "التلخيص": صحيحٌ، وحَسَّنَهُ الألباني.

﴿رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ آل عمران، واتە: (ئەی موحەممەد) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، شوێنی من بکەون، ئەو کاتەش خوا ئێوەی خۆشدەوێ‌و، وە لە گوناهەکانیشتان دەبووری، وە خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

١٠)- سیفەتی بەزەیی‌و نەرم‌و نیانی هۆکارێکی گرنگە بۆ ئەوەی خەڵك لە دەورت کۆببنەوەو لەو ڕێگایەوە بتوانی خزمەتێك بکەی، چونکە خوا دەربارەی هۆکاری شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن هاوەڵانەوە فەرموویەتی: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، واتە: بە هۆی ڕەحمەت‌و بەزەییەکەوە لەلایەن منەوە نەرم‌و (بەبەزەیی) بووی لەگەڵ (هاوەڵانت) ئەگەر تۆ کەسێکی زبرو دڵ ڕەق‌و توندو تیژ بووای لەگەڵیان دەوریان چۆڵ دەکردی‌و لێت دوور دەکەوتنەوە. کەواتە: بە هۆی هەبوونی ئەو سیفەتە کەسێکی خۆشویستراو دەبین لەلایەن خەڵك.

# پاداشتی پاڕانەوە لە خوای گەورە

# و

# سزای نە پاڕانەوە لە خوای گەورە

**پاداشت:** {«**لاَ يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلا يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلاَّ الْبِرُّ**»}[(١)]

واته: هیچ شتێك قه‌ده‌ری خوا ڕه‌ت ناكاته‌وه جگه له دووعاو پاڕانه‌وه، وه هیچ شتێكیش ته‌مه‌ن درێژ ناكات جگه له چاكه كردن (له‌گه‌ڵ خه‌ڵك به گشتیو دایكو باب به تایبه‌تی).

**سـزا:** {«**مَنْ لَمْ يَدْعُ اللهَ سُبْحَانَهُ غَضِبَ عَلَيْهِ**»}[(٢)]

واته: هه‌ر كه‌سێك داوا له خوای پاكو بێگه‌رد نه‌كاو لێی نه‌پاڕێته‌وه خوا لێی تووڕه ده‌بێ.

## ڕوونكردنه‌وه

١)- ئه‌م فه‌رمووده‌ی یه‌كه‌م به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی قه‌ده‌ری خوا ڕه‌ت ده‌بێته‌وه به هۆی دووعا كردن، چونكه دووعاش به‌شێكه له قه‌ده‌ری خوا، بۆ نموونه: خوای په‌نهانزان شتێكی بڕیارداوه كه ئه‌و شته ببێ، له هه‌مان كاتدا بڕیاریشی داوه، كه ئه‌گه‌ر ئه‌و به‌نده‌یه دووعای كرد ئه‌و شته نابێ، بۆیه كاتێك به‌نده ئه‌و دووعایه ده‌كات ئه‌و شته ڕه‌ت ده‌بێته‌وه، به‌ڵگه‌شمان ئه‌م فه‌رمووده‌یه: {**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ: «لاَ يُغْنِي حَذَرٌ مِنْ قَدَرٍ، وَالدُّعَاءِ يَنْفَعُ مِمَّا نَزَلَ وَمِمَّا لَمْ يَنْزِلْ، وَإِنَّ الْبَلاَءِ لَيَنْزِلُ، فَيَتَلَقَّاه الدُّعَاءُ، فَيَعْتَلِجَانِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»**}[(٣)]

واته: عائیشه خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هیچ سوودی نیه وریا بوونو حه‌زه‌ر كردن له قه‌ده‌ر، وه دووعا سوودی هه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی نێرراوه‌ته خوارو ئه‌وه‌ی نه‌نێرراوه‌ته خوار، وه بێگومان به‌ڵاو موصیبه‌ت دێته خوار له‌گه‌ڵ دووعا به‌یه‌ك

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (١٨١٤)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيث صَحِيحُ الإسناد، وَحَسَّنَهُ الألباني.
٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَة: (٣٨٢٧)، وَحَسَّنَهُ الألباني في "الصحيحة": (٢٦٥٤).
٣) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: برقم: (١٨١٣)، وَحَسَّنَهُ الألباني في "صَحِيح الجامع": (٧٧٣٩).

ده‌گه‌ن، ململانێ ده‌كه‌ن هه‌تا ڕۆژی دوایی، (واته: ئه‌م دووعایه ئه‌و به‌لاو موصیبه‌ته ڕاده‌گرێو، وا ده‌كات جێبه‌جێ نه‌بێ).

٢)- به‌ڵام ده‌بێ ئه‌وه‌ش بگوترێ هیچ كه‌سێك نازانێ له (اللوح المحفوظ) چ شتێكی بۆ نووسراوه، وه ئه‌وه‌ش كه نووسراوه به دوورو درێژییه، یان به كورتی، هه‌ر له‌به‌ر هه‌ندێشه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پێی فه‌رمووینه: {«**كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ**»}[1]، واته: هه‌موو كه‌سێك ئه‌نجامدانی ئه‌وه‌ی بۆ ئاسان ده‌كرێ كه بۆی دروست كراوه، كه‌واته هیچ كه‌سێك بۆی نیه بڵێ: من به‌ندایه‌تی بۆ خوا ناكه‌م چونكه بۆم نووسراوه، چونكه هیچ كه‌س نازانێ چی بۆ نووسراوه!!

٣)- هیچ شتێك له لای خوای بێ وێنه به ئه‌ندازه‌ی دووعاو پاڕانه‌وه خۆشه‌ویستترو به‌ڕێزتر نیه، وه‌ك پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: {«**لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الدُّعَاءِ**»}[2]، واته: هیچ شتێك نیه له دووعاو پاڕانه‌وه كردن به‌ڕێزتربێ له‌لای خوای پاك‌و بێگه‌رد.

٤)- به‌ڕاستی ئه‌م ئایه‌ته قورئانییه كه باسی دووعا كردنی به‌نده ده‌كات له خوای به‌رز زۆرجێی سه‌رنجه، كه ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، واته: وه هه‌ر كاتێك به‌نده‌كانم له‌باره‌ی منه‌وه پرسیاریان لێكردی (واته: له تۆ ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ) ئه‌وه (بابزانن كه) من نیزیكم، وه‌ڵامی داواكه‌ر ده‌ده‌مه‌وه هه‌ركات لێم بپاڕێته‌وه، ده‌جا با ئه‌وانیش به ده‌نگمه‌وه بێن‌و بڕوام پێ بێنن، به‌ڵكو سه‌ر ڕاست بن.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٨٤٧)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٧١١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٠٧).

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٧٣٣)، وَالْبُخَارِيُّ فِي الأدب المفرد برقم: (٧١٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٧٠)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٧٠)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٠١) وَقَالَ: صحيح الإسْنَاد، وَالبَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: (١١٠٦).

جا ئەگەر وردبینەوە لەم ئایەتەدا خۆشەویستی خوامان بۆ دووعاو پاڕانەوە بۆ دەردەکەوێ:[1] لەم ئایەتە قورئانیەدا حەوت (٧) ئاماژە کراون بە خوای بێهاوتا، حەوت (٧) ئاماژەش بە بەندەکانی بە ئەندازەی یەك:

یەکەم: ئەو شوێنانەی باسی بەندەکانیان تێداکراوە یان ئاماژەیان بۆ کراوە:

١/ ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ ﴾، وە ئەگەر لێیان پرسی، لێرەدا ڕاناوی ﴿ك﴾، بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢/ ﴿ عِبَادِي ﴾، بەندەکانم.

٣/ ﴿ ٱلدَّاعِ ﴾، داواکەر.

٤/ ﴿ إِذَا دَعَانِ ﴾، ئەگەر لێم پاڕایەوە.

٥/ ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي ﴾، پیتی ﴿وا﴾، واتە: با ئەوان بە دەنگمەوە بێن.

٦/ ﴿ وَلْيُؤْمِنُواْ بِي ﴾، با ئیمانم پێ بێنن، ئەوە شوێنی شەشەمە.

٧/ ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، بۆ ئەوە کە سەر ڕاست بن، ئەوە هەرحەوت شوێنەکە بەنسبەت بەندەکانەوە.

دووەم: ئەو شوێنانەی باسی خوای بەبەزەیی یان تێداکراوە، یان ئاماژەی پێکراوە:

١/ ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي ﴾، ڕاناوەکە بۆ خوا دەگەڕێتەوە ئەوە شوێنی یەکەم.

٢/ ﴿ عَنِّي ﴾ ئەوە شوێنی دووەم.

٣/ ﴿ فَإِنِّي ﴾، ئەوە شوێنی سێیەم.

٤/ ﴿ أُجِيبُ ﴾، ئەوە شوێنی چوارەمە، واتە: وەڵامی دەدەمەوە لێرەدا ڕاناوی قسە بێژ (مُتَكَلِّم)ی تێدا شێرراوەتەوە.

٥/ ﴿ دَعَانِ ﴾، ئەوە شوێنی پێنجەمە.

---

١) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، تەفسیری سوورەتی بەقەرە، ئایەتی ١٨٦.

٦/ ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى ﴾، ئەوە شوێنی شەشەمە.

٧/ ﴿ وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى ﴾، ئەوەش شوێنی حەوتەمە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خوا سبحانەوتعالی بەندەی خۆی زۆر خۆشدەوێ و زۆر گرنگی پێ دەدا و زۆر ڕێزی دەگرێ، چونکە هەر سیفەتێکی خۆی لەگەڵ سیفەتێکی بەندەکەی دا بەراورد کردوە.

٥)- هەمیشە خوای پەروەردگار حەز دەکات ڕاستەوخۆ گفتوگۆ لەگەڵ بەندەکانی بکات، بەبەڵگەی ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾، واتە: بێگومان من نزیکم، جێی سەرنج ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾، نەیفەرمووە: (فَقُلْ لَهُمْ إنِّي قَرِيب) یەکسەر فەرموویەتی: من نزیکم، واتە: پێغەمبەری ﷺ نەکردۆتە واسیتەی نێوان خۆی و بەندەکانی، ئەمەش یانی: هەر بەندەیەك ویستی لەگەڵ خوا بدوێ، یەکسەر ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە دەکات و پێویست ناکا لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بێ، کەواتە: لە ئیسلام دا واسیتە نیە، لە ئیسلام دا ئینسانەکان هەموویان ڕاستەوخۆ دەتوانن لەگەڵ خوای خۆیاندا ڕازو نیاز بکەن‌و لێی بپاڕێنەوەو بەندایەتیی بۆ بکەن.

٦)- لە فەرموودەی دووەم دەردەکەوێ خوا زۆر ڕقی لە کەسێکە دووعا ناکات‌و لە خوا ناپاڕێتەوە، چونکە یەکێك لە سیفەتەکانی ئینسانی خۆبەگەورەزان ئەوەیە زۆر بە کەمی دووعا دەکاو دەستی بۆ لای خوا بەرز دەکاتەوە.

٧)- خوای پەروەردگار لە ئایەتێکدا زۆر بە تەئکیدی دەفەرموێ: وەڵامتان دەدەمەوە: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر، واتە: وە پەروەردگارتان دەفەرموێ: داوام لێ بکەن، وەڵامتان دەدەمەوە، وە بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورەزانن (شەرمیان بە خۆیە داوام لێ بکەن) لە بەندەکانم لەمەودوا دەیانخەمە ئاگری دۆزەخەوە.

وە خوای باڵادەست شەرم دەکات لە کەسێك کە داوای شتێکی لێ بکات‌و پێی نەبەخشێ، وەك لەم دەقەدا هاتووە: {عَنْ سَلْمَانَ الفَارِسِي ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:

**«إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً خَائِبَتَيْنِ»**}[1] واتە: سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز بەشەرم و بەڕێزە، شەرم دەکات ئەگەر پیاوێك دەستەکانی بەرز بکاتەوەو لێی بپاڕێتەوە ڕەتی بکاتەوە، بە بە تاڵی، (واتە: حەتمەن وەڵامی دەداتەوە).

٨)- لەسەر مسوڵمانان پێویستە چۆن دووعا بۆ خۆیان دەکەن ئاواش دووعا بۆ براو خوشکانی خۆشیان بکەن، لەبەر ئەوەی بە هەر مسوڵمانێك چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: {**عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ** رضي الله عنه، **قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ** ﷺ **يَقُولُ: مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً»**}[2] واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك (لە خوا بپاڕێتەوەو) داوای لێ خۆشبوون بۆ ئیماندارانی پیاوو ئافرەت بکات بە ئەندازەی ژمارەی ئیماندارانی پیاوو ئافرەت خوا چاکەی بۆ دەنووسێ.

کەواتە: یانی ئەگەر تۆی مسوڵمان بڵێی ئەی خوای لێبووردەو بەبەزەیی! ئەی پەروەردگاری میهرەبانم! لێت دەپاڕێمەوەو تکات لێدەکەم بە بەخشندەیی‌و بەزەییە فرەوانەکەت لە مسوڵمانان خۆشبی، هەر کە لە ناخی دڵەوە ئەم دووعایەت کرد، ڕاستەوخۆ بە ئەندازەی ژمارەی هەموو مسوڵمانان پاداشتت بۆ دەنووسرێ!!

٩)- کاتێك دووعا بۆ کەسێك دەکەی فریشتەیەك بە تایبەت دانراوە بۆ ئەوەی هەمان دووعات بۆ بکاتەوە، وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: {**عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَدَّثَنِي سَيِّدِي أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ** ﷺ **يَقُولُ: «مَنْ دَعَا لأَخِيهِ بِظَهْرِ**

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ أحمد برقم: (٢٣٧٦٥)، والترمذيُّ برقم: (٣٥٥٦) وقالَ: حسَنٌ غريبٌ، والحاكمُ برقم: (١٩٦٢) وقالَ: صحيحٌ علَى شرْطِ الشَّيخَيْن، والبيْهقيُّ في "الكُبرى" برقم: (٢٩٦٥) وصحَّحهُ الألبانِي.

٢) صَحيحٌ: أخرجهُ الطَّبرانيُّ في "مُسْنَد الشاميين" برقم: (٢١٥٥)، قالَ الهيْثميُّ: إسْنادُهُ جيِّد، وحسَّنَهُ الألباني في "صَحيح الجامع": (٦٠٢٦).

الْغَيْبِ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ»}[1] واته: ئومو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گەورەکەم بۆی گێڕامەوە (واتە: پیاوەکەم، کە دەکاتە: باوکی دەرداء، خوا لێیان ڕازی بێ) کە ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: هەر کەسێك دووعا لە پاشملە بۆ براکەی بکات بە پەنهانی، فریشتەیەکی ڕاسپێرراو بەوەوە دەڵێ: (خوایە) قبوڵی بکە، وە بۆ تۆش بە وێنەی ئەوە.

١٠)- ئادابەکانی دووعا کردن:

ستایشتی شایستە بە خوا، بۆ خوا، هەموو شتێك لە ئیسلام ئادابی تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەوەش ڕێكو پێکی ئەو بەرنامەو پەیامە پیرۆزە دەگەیەنی، ئێستاش هەندێك لەو ئادابانە دەنووسین، کە ڕەچاوکردنیان مایەی قبووڵ بوونی دووعایە:

ئیخلاصو دڵی خۆ سافو ساغ کردنەوە لە بەرانبەر خوا.

بە سوپاسو ستایشی خوای بێ وێنەو صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەست پێ بکرێو کۆتایی پێ بێ.

باوەڕی تەواوت هەبێ کە خوا دووعاکەت قبووڵ دەکات.

زۆر کردنو سوور بوون لەسەر ئەوەی خوا وەڵامت بداتەوە، بەڵام پەلە نەکردن لە وەڵامدانەوەی.

لە ناخی دڵەوە ئاگات لە وشانە بێت کە لە زارت دێنە دەر، نەك دڵت لەلایەکی دیکەبێ.

بەردەوام دووعا کردن لە کاتی خۆشیو ناخۆشیی دا.

داوا لە غەیری خوا نەکەی.

دەنگت نزم بکەوە، لە نێوان دەنگی بەرزو بێ دەنگی، واتە: هەر تەنیا خۆت گوێت لە دەنگی خۆت بێ.

دان بە گوناهی خۆت دابێنە لەلای خوا پەروەردگار داوای لێ دەکەی، وە باسی چاکەکانی خوا بکە کە لەگەڵی کردوویو سوپاسیشی لەسەر بکە.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٢٧٣٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٥٣٤).

زۆر بە بێهێزیو ملکەچی ترسانو ئومێدی لێ خۆشبوونەوە دووعا بکە.

کە داوای شتێك دەکەی هەر یەك جار ناوی مەهێنە، هەوڵدە تا سێ جاران ناوی ئەو شتە بێنی.

ڕووشت لە قیبلە بێ باشترە.

بەرزکردنەوەی هەردوو دەستەکانت لە دووعادا زۆر پێویستە.

داواکردن بە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوای بەرز، یان بە کارێکی چاك کە بۆ خوات ئەنجامداوە بە ئیخلاصی.

# پاداشتی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی

# و

# سـزای پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی

**پاداشت**: {«**صَدَقَةُ السِّرِّ تُطْفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيْدُ فِي الْعُمرِ، وَفِعلُ الْمَعْرُوف يَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ**»}(١)

واته: خێرکردن به نهێنی تووڕەیی خوا دەکوژێنێتەوەو کپی دەکاتەوە، وە بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتیو سەردانی کردنیان تەمەن (ی ئینسان) زیاد دەکات، وە کردەوەی چاك (یش ئینسان) دەپارێزێ لە مردنی لە حاڵەتو شوێنی خراپ.

**سـزا**: {«**لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ**»}(٢) **يَعْنِي: قَاطِعَ رَحِمٍ.**

واته: (ڕاستەوخۆو بەبێ حیسابو لێپرسینەوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندوە.

## ڕوونکردنەوە

١)- هەمیشە خێر کردن لە پێناوی خواو بە مەبەستی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوا تووڕەیی خوا لادەبات، بۆیە کاتێك هەست دەکەین بە هۆی سەرپێچیەکەوە خوامان لە خۆمان تووڕە کردوە، وا باشە بۆ ئاشتکردنەوەی خوا، تۆبە بکەینو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەین، ئنجا بە پێی ئەوەی لە توانامان دایە خێرو صەدەقە بکەین.

٢)- بە یەك سەردانی کردنت بۆ لای برای مسوڵمانی خۆت، بە مەرجێك ئەگەر ئەم دانیشتنە دووربێ لە گوناحو تاوانو غەیبەت کردن، حەفتا هەزار فریشتە دووعات بۆ دەکەن، پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەیفەرموو: {«**مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِماً غُدْوَةً إلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ**»}(٣) واته: هیچ مسوڵمانێك نیە کە بچێ سەردانی مسوڵمانێك بکات لە

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرانِيُّ فِي "الكُبرى": (١٠١٨) عَنْ مُعَاوِيَة بْنِ حَيْدَةَ ﷺ، صَحِيحٌ بمجْمُـوعِ طُرُقِـهِ وشَوَاهِدِهِ.

٢) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٧٧٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٦٨٤).

٣) حَسَنٌ: أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٩٦٩) وَقَالَ: هذَا حَدِيثٌ حسنٌ غريبٌ، وصَحَّحَهُ الألبانِي.

بەیانی، ئەوە حەتمەن حەفتا هەزار مەلائیکە دووعای بۆ دەکەن هەتا ئێواریێ، وە ئەگەر بەشەو سەردانی بکات، حەفتا هەزار مەلائیکە دووعای بۆ دەکەن هەتا بەیانی.

٣)- جا ڕەنگە پرسیارێك لێرەدا لە لای هەندێك کەس دروست بیێو بڵێن: ئایا چۆن تەمەن درێژ دەبێ، لە کاتێکدا خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾﴾النحل، واتە: جا کاتێك کاتی مردنیان هات (ماوەیان لە ژیان تەواو بوو) هیچ کاتو ساتێك دواناکەونو پێشیش ناکەون (واتە: لە کاتی دیاری کراوی خۆیان دەمرن)! وەڵامی ئەم پرسیارە بە دوو خاڵ دەدرێتەوە:

**یەکەم**: دەگونجێ مەبەست لە درێژبوونەوەی تەمەن بەرەکەتی تەمەن بێ، بەو مانای کە خوای باڵادەست بەرەکەتی خۆی دەخاتە ژیانی ئەو کەسە، بۆ نموونە: ئەگەر کارێك بە گشتی ماوەی سێ ساڵی بوێ بۆ ئەوەی بە تەواوی ئەنجام بدرێ، ڕەنگە خوای بەرز یارمەتی ئەو کەسە بدات کە لە ماوەی یەك ساڵ تەواوی بکات، دیارە ئەوەش وەك ئەمە وایە تەمەنی درێژ بوویێتەوە!

**دووەم**: وە دەشگونجێ مەبەست لەم زیادبوونو درێژبوونەوەی تەمەنە دووشتی دی بێ، ئەوانیش زۆر کردنی ڕزقو ڕۆزیو ساغو سەلامەت کردنی جەستەو لەشی ئەو کەسە، لەبەر ئەوەی گوتراوە: (**الفَقر هُوَ المَوْتُ الأَكبَر**) هەژاریی مردنی هەرە گەورەیە.

٤)- هەبوونی پەیوەندی خزمایەتی بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ**»}[1]، واتە: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بگەیەنێ.

٥)- بە هۆی سەردانی کردنی مسوڵمانێك لە پێناوی خوا شوێنێك بۆ خۆت لە بەهەشت مسۆگەر دەکەی: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه **قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ** ﷺ: «**مَنْ عَادَ مَرِيْضاً أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ فِي اللهِ، نَادَاهُ مُنَادٍ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاك، وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ**

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٨٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه.

**مَنْزِلاً»**}[١]، واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سەردانی نەخۆشێك، یان برایەکی خۆی بکات (بێ ئەوەی نەخۆش بێ) بانگبێژێك بانگ دەکاتو پێی دەڵێ: خۆشی بۆ خۆت، بە هۆی ئەم سەردانەتەوە، شوێنێکت لە بەهەشت بۆ خۆت مسۆگەر کرد.

٦)- خوای گەورە زۆر ڕقی لەو کەسە دەبێتەوە، کە پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندوە، بەبەڵگەی ئەم دەقە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**«أَبْغَضُ الأَعْمَالِ إِلى اللهِ الإِشْرَاكُ بِاللهِ، ثُمَّ قَطِيعَةُ الرَّحِمِ»**}[٢] واتە: بوغزێنراوترین کارە (خراپەکان) لە لای خوا بریتیە لە: هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، پاشان پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

٧)- هەر کەسێك پەیوەندی ڕەحمو خزمایەتی بپچڕێنێ، خواش پەیوەندی لەگەڵ دەپچڕێنێ، وەك لەم دەقەدا هاتووە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ **عَنِ النَّبِيِّ** ﷺ **قَالَ: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَ الخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُم، قَامَتِ الرَّحِمُ، قَالَتْ: هَاذَا مَقَامُ العَائِذِ بِكَ مِنَ القَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَما تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ! قَالَ: فَذَلكِ لَكِ»**}[٣]، واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: دوای ئەوەی خوای بەرز دروست کراوەکانی دروست کرد، هەتا تەواوی کردن (رحیم) هەڵسا (واتە: خزمایەتی هەڵستا) گوتی: ئێرە شوێنێکە، کاتێك پەنات پێ دەبردرێت لە پچڕاندن، پەنا دێنمە بەر تۆ لەوەی کە بپچڕێنرێم، خواش فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازی نابی کە هەر کەسێك تۆ بگەیەنێ منیش بیگەیەنم؟! (واتە: بیگەیەنم بە ڕەحمەتی خۆم)، وە هەر کەسێك تۆ بپچڕێنێ منیش بیپچڕێنم (واتە: بەزەیی خۆمی لێ دوور بخەمەوە)؟! خزمایەتی گوتی: بەڵێ، خواش فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ بێ، واتە: هەر کەسێك پەیوەندی

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٨) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبو يَعْلَى برقم: (٦٨٣٩)، قالَ الْمُنْذِرِيُّ: إِسْنَادُهُ جيد، وَقَالَ الهيثمي: رِجَالُهُ رِجَالُ الصحيحِ، غيرُ نَافِع بْنِ خالد الطاحي، وهُوَ ثقة، وحَسَّنَهُ الألباني في "صحيح الجامع" برقم: (١٦٦).

٣) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣٤٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٤١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٥٤) وَالنَّسائِيُّ في "الكبرى" برقم: (١١٤٩٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤١)، وَالحاكِمُ برقم: (٣٠٠٥).

خزمایەتی بگەیەنێ خوا ڕەحمەتی خۆی پێ دەگەیەنێ، هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ خوای بەرز بەزەیی لێ دادەبڕێنێ.

٨)- هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ، ئەوە با بزانێ بەڵێنو پەیمانێك کە لەگەڵ خوای بەستوە شکاندوویەتی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەوانەی کە پەیمانی خوا پاش پتەو کردنی هەڵدەوەشێننەوە، وە ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ دەیپچڕێنن، وە خراپەکاریی لە زەویدا دەکەن، ئا ئەوانەن زیانباران.

٩)- ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ با باش بزانێ کردەوە باشەکانی لێ قبووڵ ناکرێ، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**إِنَّ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ تُعْرَضُ كُلَّ خَمِيس لَيْلَةَ الْجُمُعَة فَلاَ يُقْبَلُ عَمَلُ قَاطِعِ رَحِمٍ**»}[1]، واتە: بە دڵنیایی کردەوە (چاکە)کانی ئادەمیزاد بەرزدەکرێنەوەو ڕادەنوێنرێن (بۆ خوای پەروەردگار) هەموو پێنج شەممەیەکی شەوانی هەینی کردەوەی ئەوانە وەرناگیرێ کە پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاندوە.

١٠)- ماوە بڵێم: یەکێك لە هۆکارەکانی چوونە بەهەشت بریتیە لە بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی، وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: {**عَنْ أَبِي أيُوب** رضي الله عنه: **أنّ رَجُلاً قَالَ للنَّبيِّ** ﷺ: **أَخْبِرْنِي بِعَمَل يُدْخِلُنِي الجَنَّة، قَالَ: «تَعْبُدُ اللهَ، وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ»**}[2]، واتە: ئەبو ئەییوب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: هەواڵم پێبدە بە کردەوەیەك (کە بیکەمو) بمباتە بەهەشتەوە، فەرمووی: خواپەرستەو هیچ شتێکی بۆ بە هاوەڵ دامەنێ،

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٢٧٧)، قَالَ الهَيْثَمِيُّ: رِجَالُهُ ثِقَات، وَالخَرَائطي في "مساوئ الأخلاق" برقم: (٢٧٩)، وَالبُخَارِيُّ في "الأَدَب المُفْرَد" برقم: (٦١)، وَالبَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (٧٩٦٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ، تعليق الألباني: حَسَنٌ.

٢) صحِيحٌ: أَخْرَجَهُ البُخاريُّ برقم: (١٣٣٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٣).

وە نوێژ بەرپابکەو چاك ئەنجامی بدە، زەکاتیش لە ماڵەکەت دەربکە، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنە.

**پاداشت:** {«مَا عَمِلَ ابنُ آدَمَ شَيْئاً أَفضَلَ مِنَ: الصَّلاَةِ، وَصَلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَخُلُقٍ حسن»}[١]

واتە: هیچ شتێك لە كردەوەیەكی بەنی ئادەم نیە (پاداشتی) باشتربێ لە نوێژو چاككردنەوەو ئاشتكردنەوەی نێوان دوو كەسانو ڕەوشت جوانی.

**سـزا:** {«لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»}[٢]

واتە: (ڕاستەوخۆو بەبێ حیسابو لێپرسینەوە) ناچێتە بەهەشت ئەو كەسەی قسە دێنێو دەبات لە نێوان خەڵك (بۆ ئەوەی نێوانیات تێكبدات).

## ڕوونكردنەوە

١)- هاوكاری كردنی مسوڵمانان لە نێوان خۆیان بە هەموو شێوەكانیەوە فەرمانی خوای پەروەردگارە، وەك خوای بەرز لە سووڕەتی (المائدة) فەرموویەتی: ﴿ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: هاوكاری یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی مسوڵمانان برای یەكدین، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر شتێك لە ناكۆكی كەوتە نێوان برایانتان ئاشتیان بكەنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾الحجرات، واتە: بێگومان ئیمانداران برای یەكدین، جا نێوان براكانی خۆتان چاك بكەنو، پارێز لە خوا بكەن، بەڵكو خواش ڕەحمتان پێ دەكات.

٢)- جا لەبەر گەورەیی ئەم كارەو پیرۆزی لە ئیسلام دا، ئەگەر ئەو كەسەی لە نێوان دوو كەس، یان دوو كۆمەڵ، دێو دەچێ بۆ ئەوەی ئاشتیان بكاتەوە قسەی ناڕاستیش بكات بۆ ئاشتكردنەوەیان بە درۆزن دانانرێو بەڵكو پاداشتیشی هەیە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ فِي "التاريخ الكَبِير"، وَالْبَيْهَقِي فِي "شُعَب الإيـمَان" برقم: (١١٠٩١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: برقم (٥٧٠٩)، وَمُسْلِمُ برقم: (٣٠٤) عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ.

ﷺ فەرموویەتی: {«**لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِي خَيراً، أَوْ يَقُولُ خَيراً**»}[1]، واتە: بە درۆزن دانانرێ ئەو کەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵکی پێ چاك دەکاتەوەو لە نێوانیان قسە دێنێو دەبات، یان قسەی خێر دەکات.

٣)- ئەگەر هەڵسی بە ئاشتکردنەوەی نێوان دوو کەس، یان دوو کۆمەڵ هەتا ئەوان تەباو گونجاوبن، کاری خێر بکەن تۆ بەشداری لە هەموو پاداشتەکانیان، لەبەر ئەوەی ڕێنماییکەر بووی بۆ ئەو خێرە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {«**مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا**»}[2]، واتە: هەر کەسێك خەڵکی بەرەو هیدایەت بانگ بکات بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوونو گوێڕایەڵیان کردوە پاداشتی هەیەو، هیچ لە پاداشتی ئەوانیش کەم ناکاتەوە.

٤)- ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك یەکێکە لە خۆشەویسترین کردەوەکان لە لای خوای بالادەست، بەبەڵگەی ئەم فەرموودە: {**عَنْ أَبُو أَيُّوبَ** ﷺ، **قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ** ﷺ: «**أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى صَدَقَةٍ يُحِبُّهَا اللهُ وَرَسُولُهُ؟ تُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ إِذَا تَبَاغَضُوا وَتَفَاسَدُوا**»}[3]، واتە: ئەبوو ئەییوب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا هەواڵت پێنەدەم بۆ ئەنجامدانی کارێکی چاك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێ؟ (حەتمەن ئەویش گوتوویەتی بەڵێ هەواڵم پێ بدە) فەرمووی: ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵکی کاتێك کە لێك توورە دەبنو ئاشووب دەنێنەوە (لە نێوان خۆیان).

جا بۆ ئاگاداری هەموو لایەك:

هەر کارێك خوا پێی خۆشبێ، هەر کەسێك ئەنجامی بدات ئەوە خواش ئەوە کەسەی خۆشدەوێ، وە هەر کەسێکیش خوا خۆشی بوێ لە ڕۆژی دوایی بە ڕووی پێ دەکەنێ، وە

---

١) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٥٤٦)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٧٩٩).
٢) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٩١٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٧٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٠٩).
٣) حسنٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الكبير" برقم: (٣٩٢٢)، وَحَسَّنَهُ الألباني.

دڵنیاش بن هەر کەسێك خوا بە ڕووی پێبکەنێ حیسابی لەگەڵ ناکاتو دەیخاتە بەهەشتەوە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**إِنَّ رَبَّكَ إِذَا ضَحِكَ إِلَى قَوْمٍ فَلاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ**»}[1]، واتە: بێگومان ئەگەر پەروەردگارت بۆ کۆمەڵێك پێ بکەنێ ئەوە لێ پرسینەوەیان لەسەر نیە!!

٥)- ئەگەر سەرنج بدرێ، دەبینین خوای کاربەجێ هەوڵدان بۆ ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵکی پێش ڕەوشت جوانی خستوە، لەگەڵ ئەوەش ئەو کارە یەکێکە لە ڕەوشتە هەرە جوانو باشەکان، کەواتە: ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ لە نێو هەموو ڕەوشتە جوانەکان خوای بێ وێنە ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵکی لە هەمووان پێ خۆشترەو، وە ڕەوشتی جوان لە تای تەرازووی کردەوە چاکەکان لە هەموو کردەوەیەك قورسترە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَل فِي الْمِيزَان مِنْ حُسْنِ الْخُلُق**»}[2]، واتە: هیچ شتێك نیە لە تەرازووی (چاکەکاندا لە ڕۆژی دوایی) قورستربێ لە ڕەوشت جوانی.

٦)- هەرەشەیەکی زۆر گەورە لە فەرموودەی دووەم دایە، کە دەفەرموێ: ئەو کەسەی قسە دێنێو دەبات لە نێوان خەڵك بۆ تێکدانی نێوانیان ناچێتە بەهەشت!! جا ئایا هەواڵ لەو ناخۆشتر هەیە هەر لە دنیا پێت بگوترێ: تۆ لەو حەفتا هەزار کەسە نی کە بە بێ حیساب دەچنە بەهەشت؟ ئایا لەوە ناخۆشتر هەیە، پێت بگوترێ بە هۆی ئەو سیفەتەی کە هەتە شایانی چوونە نێو ئاگری، ئایا لەو هەواڵە دڵ تووندکەرتر هەیە کە هەر لە دنیا بزانی دۆزەخی؟ ئایا لەوە ناخۆشتر هەیە هەر لە دنیا بزانێ لە نێو گۆڕ سزات بۆ دانراوە بە هۆی قسەهێنانو بردن لە نێوان خەڵك بۆ نانەوەی ئاشووب؟ ... هتد، بێگومان لەو هەواڵە ناخۆشتر نیە، مادام وایە بە زووترین کات دەستبەرداری ئەو سیفەتە ناپەسندە بەو وازی لێ بێنە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەوانەی نێوانیشت تێکداون هەوڵبدە ئاشتیان بکەیەوەو تۆوی تەبایی لە نێویاندا بچێنیو قۆڵی چاکەکاریی لێ هەڵماڵی.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط) برقم: (٤١٣١) قَالَ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبو دَاوُدَ برقم: (٤٧٠١) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٧)- بەڵام دەبێ ئاگاداربین زانایانی ئیسلام هەر هەموو یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی کە قسە دێنێو دەبا لە نێوان خەڵك، بە هەمیشەیی نامێنێتەوە لە دۆزەخ، لەبەر ئەوەی خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ...﴿١١٦﴾ ﴾النساء، واتە: بێگومان خوا لەو کەسە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ خوا داناوەو (تۆبەی لەسەر نەکردوە) وە جگە لە هاوبەش دانان بۆ خوا لە هەر گوناهێك بیەوێ دەبووری، کەواتە: لە گوناهە گەورەکان غەیری هاوبەش دانان خاوەن گوناهەکانی دی وەك: قەتل، زینا، ئەزیەتدانی دایكو باب، بوختان هەڵبەستان... هتد، لە ئاگری دۆزەخ نامێنێتەوە، بۆیە کەسێك کە نێوان خەڵك تێکدەدات ئەویش هەتا هەتایی لە ئاگر نامێنێتەوە.
بەڵام سەرەنجامی ئەو تاوانەی دەیکات زۆر گەورەو زۆر تێکدەرو وێرانکەرە، بۆیە گوتراوە:

ئەوەی کەسی نەمام دەیکات لە ساتێك

ساحیر ناتوانێ بیکات لە ماوەی ساڵێك

٨)- یەکێك لە هۆکارەکانی سزای نێو گۆڕ بریتیە لە قسە هێنانو بردن لە نێوان خەڵك، واتە: ئەو کەسەی پیشەی تێکدانی نێوان خەڵکە بە قسە گێڕانەوە با دڵنیابێ سزای نێو گۆڕ چاوەڕێی دەکات، وەك لەم فەرموودە هاتوە: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﷺ **قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ** ﷺ **بِقَبْرَيْنِ، فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ؛ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَبْرِى مِنَ الْبَوْلِ؛ وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ»**}[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای دوو گۆڕ تێپەڕ بوو، فەرمووی: ئەم دوو گۆڕە وا سزا دەدرێن، وە سزاش نادرێن بە هۆی گوناهی گەورە (واتە: ئەو دوو کەسە پێیان وا بووە ئەو دوو گوناهە گەورە نین، یان

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (١٣٠٤)، وَأَحْمَد بـرقم: (١٩٨٠)، وَالْبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٧٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٠٦٩).

ئەگەر وازیان لیّ بهێنابا زۆر گرانو گەورە نەبوو، یان ئەو دوو گوناهە لە گوناهە هەرە گەورەکان نین، ئەگەرنا، لە ئەسڵدا دوو گوناهی گەورەن)، (دوو گوناهەکانیش ئەوانەن) یەکێکان خۆی پاك ڕانەدەگرت لە پڕوشکی میز، وە ئەوەی دیکە قسەی دەهێناو دەبرد لە نێوان خەڵکیو نێوانیانی بەو قسانە تێکدەدا.

٩)- جاری وایە قسە هێنانو بردن لە نێوان خەڵك دەبێتە هۆی بوختان هەڵبەستان بۆ کەسانێکی داوێن پاك، یان هەر گوناهێکی دیکەی گەورە، ئەویش بە هۆی ئەوەی زمانمان گرنگی بەو قسە نادات کە دەیکات، عەقڵمان بیری لێناکاتەوە، دڵمان خۆی بۆ ساغ ناکاتەوە، واتە: مەبەستێکی خراپمان هەیە لە کردنی ئەو قسەیە، جاری وایە یەکێك زۆر بە ئاسانیو بە سادەیی قسەیەك دەبیستیّو دوایی دەیگوازێتەوە دەڵێ: گوێم لە فلان بوو، دەربارەی تۆ ئاواو ئاوای دەگوت، بە هۆی ئەو قسەوە ژنو مێردێك لێك جیادەبنەوەو منداڵەکان دوور دەبن لە نازی دایكو باییان، ئافرەتەکە بێوەژن دەمێنیّو پیاویش بە تەنیایی لە نێو ماڵ دادەمێنیّ، ئەوە هەمووە کارەساتە بە هۆی یەك قسەی کەسێك کە گواستیەوە لە نێوان دوو کەس!! کە ئەوە پێی دەگوتریّ نەمیمە، کە بەڕاستی هەر خودی ئەو قسە گێڕانەوە غەیبەتەو ئەویش یەکێکە لە گوناهە گەورەکانو خواش لەوبارەوە فەرمووییەتی: ﴿ ... وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾الحجرات، واتە: وە هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان مەکەن، ئایا (ئەی مسوڵمانان!) هیچ کامێك لە ئێوە حەز دەکات کە گۆشتی برا (ی دینی) خۆی بخوات بە مردوویی؟! بێگومان بێتان ناییّو پێتان ناخۆشە، (مادام وایە) لە خوا بترسنو پارێز بکەن (غەیبەتی خەڵکی مەکەن) چونکە بێگومان خوا تۆبە وەرگری بەبەزەیی یە.

١٠)- کەمترین گوناهی تێکدانی نێوان خەڵك بریتیە لە غەیبەت، گەورەترینیان بریتیە لە بوهتان، جا زۆر کەس کاتێك باسی خەڵك دەکەن دەڵێن: باسی سیفەتێم کردوە، ئەوەی دەیڵێم تێیدایە، بێئاگا لەوەی هەر ئەوە خودی خۆی غەیبەتە، بە بەڵگەی ئەوەی ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: {«**أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟**»، **قَالُوا:**

**اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ»، قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ بَهَتَّهُ»** }[1]، واته: ئایا ده‌زانن غه‌یبه‌ت چییه؟ گوتیان: خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی باشتر ده‌زانن‌و زاناترن، فه‌رمووی: (به‌ جۆرێك) باسی براكه‌ت بكه‌ی كه‌ پێی ناخۆشبێ، گوتیان: ئه‌دی ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ده‌یڵێین تێیدابوو؟ فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی ده‌یڵێی تێیدابوو ئه‌وه‌ غه‌یبه‌تت كردوه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی ده‌یڵێی تێیدا نه‌بوو، ئه‌وه‌ بوختانت بۆی هه‌ڵبه‌ستوه‌.

١) صحيحٌ: أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٩٧٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٧٤)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (١٩٣٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧١٤)، وَالنَّسَائِيُّ فِي "الكُبْرَى" برقم: (١١٥١٨)، وَابْنُ حبَّان برقم: (٥٧٥٩)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٦٤٩٣).

**پاداشت:** {«**كُلُّ امْرِئٍ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ (أَوْ قَالَ): حَتَّى يُحْكَمُ بَيْنَ النَّاسِ**»}[1]

واتە: (لە ڕۆژی قیامەت) هەموو کەسێك لە ژێر سێبەری خێرو صەدەقەکەیەتی، تاکو دادوەری‌و دادگایی کردن لە نێوان خەڵك دەست پێدەکات.

**سـزا:** {«**مَثَلُ الَّذِي يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ، كَمَثَلِ الكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ فَيَأْكُلُهُ**»}[2]

واتە: وێنەی کەسێك کە پەشێمان دەبێتەوە لەو خێرەی کردوویەتی، وەك وێنەی سەگێکە بڕشێتەوەو، پاشان بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی‌و بیخواتەوە.

## ڕوونکردنەوە

١)- لە ڕۆژی دوایی کە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری عەرشی خوای پەروەردگار، خەڵکیش هەر یەکەو هەتا گۆزینگ، یان چۆك، یان ڕان، یان سینگیان کەوتۆتە نێو ئارەقەی خۆیان، ئەو کەسانەی بە خوا پێ مەبەست بوونەوە خێر دەکەن دەکەونە ژێر سێبەری ئەو خێرو صەدەقەی کردوویانە.

٢)- ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {«**إِنَّ اللهَ قَالَ لِي: أَنْفِقْ، أُنْفِقْ عَلَيْكَ**»}[3]، واتە: بە ڕاستی خوا پێی فەرمووم: تۆ ببەخشە، منیش پێت دەبەخشم، کەواتە: ئینسان کاتێك شتێك لە ماڵەکەی دەبەخشێ، خوا زۆر زیاتری پێ دەبەخشێتەوە، بۆچی؟ چونکە هەر کەسە بە قەدەر خۆی دەبەخشێ، ئەوەی زۆری هەبێ دەتوانێ زۆر ببەخشێ، ئەوەی کەمی هەبێ کەم ببەخشێ، خوای گەورەش دەوڵەمەندەو زۆر دەبەخشێ.

١) صحيحٌ: أخرجه أحمد برقم: (١٧٣٧١)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيحٌ على شرط مسلم.
٢) صحيحٌ: أخرجه مسلم برقم: (٤٢٥٥).
٣) صحيحٌ: أخرجه أحمد برقم: (٧٢٩٦)، والبخاريُّ برقم: (٤٤٠٧)، ومسلمٌ برقم: (٢٣٥٦).

٣)- خوا چەند بەرانبەر پاداشت دەداتەوە، وەك خوای بەخشەر لە سوورەتی (البقـرة)دا فەرمووویـەتی: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی کە سامانەکانیان لە پێناو خوادا خەرج دەکەن، وەك وێنەی دەنکێك وایە کە حەوت گوڵان دەڕوێنێ، هـەر گوڵێـك سـەد دەنکـی تێدایـە، وە خـوا بـۆ هەرکەسێك بیەوێ پاداشت چەند قات دەکاتەوە، وە خوا سیفەت فراوانی زانایە، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: {«**كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ مَا شَاءَ اللهُ**»}[1]، واتە: هەموو کردەوەیەکی (چاکی) ئادەمیزاد بە دە چـاکە بەرانبـەر پاداشـت دەدرێتـەوە هـەتاکو حـەوت سـەد بەرانبـەر، هـەتاکو ئـەو ئەندازەیەی کە خوا بۆ خۆی دەیزانێ. دیارە ئەم فەرموودە پشتگیری ئەو ئایەتـە دەکـات کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ لە حەوت سـەد بەرانبەریش زیاتر، جا لە ئەنجامی چ دا خـوا پاداشـتەکەی چـەند قـاتو چـەند بەرانبـەر دەکاتەوە، دیارە لە ئەنجامی ئیخلاصو خوا پێ مەبەست بوونی باشترو نیەتی چاکتر، وە شوێن پێگرتنی چاکتر.

٤)- خێرو صەدەقە کردن گەرمایی نێو گۆڕ ناهێڵێ: {**عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُوْلِ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَتُطْفِئُ عَنْ أَهْلِهَا حَرَّ الْقُبُوْرِ، وَإِنَّمَا يَسْتَظِلُ الْمُؤْمِنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ**»}[2]، واتە: عوقبەی کـوڕی عـامیرِ خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: بێگومـان صـەدەقە گەرماییو نارەحەتیی نێو گۆڕ لەسەر خاوەنەکەی دەکوژێنێتەوەو لادەبات، وە ئیمانـدار لە ڕۆژی دوایی دا دەچێتە ژێر سێبەری خێرو صەدەقەکەی.

---

١) صحيح: أخرجه مسلم برقم: (٢٧٠٠)، وابن ماجة برقم: (١٦٣٨).
٢) حسن: أخرجه الطبراني في "الكبير" برقم: (١٤٢٠٧)، وحسّنه الألباني.

٥)- هەرکاتێك پێغەمبەری خوا دیاریەکی بۆ هاتبا چاکتر لەو دیاریەی دەبەخشیەوە یان وەك خۆی، وەك لەو دەقەدا هاتوە: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا»}[1]، واتە: لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرتو بە باشتر لەو دیاریە دیاری دەبەخشیەوە.

٦)- خەڵاتو دیاری هۆکاری دروست کردنی خۆشەویستیە لە نێوان خەڵك، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«تَهَادُوْا تَحَابُّوا»}[2]، واتە: دیاریو خەڵات بدەنە یەکدیو یەکدیتان خۆشدەوێ.

٧)- کاتێك شتێك دەبەخشرێ جا بە دیاریی، یان بە صەدەقە حەرامە پەشێمان بوونەوە لێی حەرامە، تەنیا لە یەك کاتدا نەبێ، ئەویش ئەگەر منداڵی خۆت بێ، شتێکی پێبدەیو دوایی لەبەر هۆکارێك لێی وەربگریەوە، بە بەڵگەی ئەم دەقە: یەکێك لە هاوەڵان منداڵێکی پێ بوو، گوتی: ئەو دیاریەم داوەتێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا»}[3]، واتە: ئایا وێنەی ئەم دیاریەت داوە بە هەموو منداڵەکانت؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {فَأَرْجِعهُ} واتە: بگەڕێوەو لێوەربگرەوە.

٨)- هەر گیز منەت لەسەر ئەو کەسە مەکە کە خێرت پێکردوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«ثَلاَثَةٌ لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَمُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى»}[4]، واتە: سێ (جۆرە کەس هەن) خوا تەماشایان ناکات لە ڕۆژی قیامەت: ئەوەی ئەزیەتی دایكو بابی داوە، ئەوەی بەردەوام بووە لەسەر خواردنەوەی شەڕاب (تا مردن)، ئەوەی خێرێك دەکاتو دوایی منەت لەسەر ئەو کەسە دەکات کە خێری پێکردوە.

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ البُخاريُّ برقم: (٢٤٤٥)، وأبو داوُدَ برقم: (٣٥٣٦)، وغيرهما.
٢) حسنٌ: أخرجهُ البُخاريُّ في "الأدب المُفْرد" برقم: (٥٩٤)، قال الألباني: حسنٌ.
٣) صحيحٌ: أخرجهُ البُخاريُّ برقم: (٢٥٨٧)، ومُسْلِمٌ برقم: (١٦٢٣).
٤) صحيحٌ: أخرجهُ إبْنُ حِبَّان برقم: (٧٣٤٠)، قال شُعيب الأرْؤوط: إسْنادهُ صحيحٌ.

٩)- پرسیارێك زۆر گرنگە، وەڵام بدرێتەوە ئایا دیاری دەكرێتەوە دیاری؟ بەڵێ، لە ناو خەڵكی باوە دیاری ناكرێتە دیاری، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەمەیەو، زۆرجار پێغەمبەر ﷺ شتێكی كراوەتە دیاری، هەر ڕاستەوخۆو لەو شوێنە بەخشیویەتیەوەو كردیتیەوە دیاری.

١٠)- وێكچوواندنی كەسێك بە سەگ لەسەر كردەوەیەكی گوناح، بەڵگەی گەورەی گوناهەكەیە. خوا هەموو لایەكمان بپارێزێ لەم ڕەفتارە..!

# پاداشتی کۆڕێك كە زیكری خوای تێدایە

# و

# سزای کۆڕێك كە زیكری خوای تێدانییە

**پاداشت:** **{مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً يَذْكُرُونَ اللهَ (عَزَّ وَجَلَّ) فِيهِ فَيَقُومُونَ، حَتَّى يُقَالُ لَهُمْ: قُومُوا قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ، وَبُدِّلَتْ سَيِّئَاتكُمْ حَسَنَاتٍ»}** [١]

واتە: هەر کۆمەڵە خەڵکێك لە کۆڕێك دانیشن، یادی خوای زاڵی خاوەن شكۆی تێدا بکەن هەڵناستن، هەتا پێیان دەگوترێ: هەڵسن، بێگومان بوردران لە گوناهەکانتان، وە خراپەکانیشتان بۆ گۆڕدرا بە چاکەکان!

**سزا:** **{مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوا اللهَ تَعَالَى فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ فِيهِ، إلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةٌ؛ فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ}** [٢]

واتە: هەر کۆمەڵە خەڵکێك لە کۆڕێك دانیشن، زیكری خوای بەرزی تێدا ناکەن و صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرەکەیان نەدەن، ئیللا بۆیان دەبێتە مایەی زەرەرمەندی و پەشێمانی، ئەگەر (خوا) بیەوێ سزایان دەدات، ئەگەر بشیەوێ لێیان خۆشدەبێ.

---

١) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "الكَبِير": (٦٣٩)، وَصَحَّحَهُ الألبانِي.

٢) صَحِيحٌ: أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بِرَقم: (٣٣٨٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَالَ الأَلبَانِي: صَحِيحٌ.

## پاداشتی فێربوونی زانست بۆ خوا
## و
## سزای فێربوونی زانست بۆ غەیری خوا

**پاداشت:** {«**مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ لا يُرِيدُ إِلا أَنْ يَتَعَلَّمَ خَيْرًا أَوْ يُعَلِّمَهُ، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ حَاجٍّ تَامًّا حِجَّتُهُ**»}[1]

واتە: هەر کەسێك بڕوات بۆ مزگەوت هیچ مەبەستێکی نەبێت جگە لەوە کە بیەوێ فێرە شتێکی چاك بێ، یان خەڵك فێرە شتی چاك بکات، ئەوە پاداشتی حاجیەکی بۆ دەنووسرێ کە حەجەکەی بە تەواوی ئەنجام دابێ.

**سزا:** {«**مَنْ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ وَيُجَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ وَيَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ أَدْخَلَهُ اللَّهُ جَهَنَّمَ**»}[2]

واتە: هەر کەس فێری زانستێك بێ بۆ ئەوەی شانازی بەسەر زانایانەوە بکات، یان موناقەشەی پێ لەگەڵ نەزانان بکاتو سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، ئەوە خوا دەیخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

---

(١) حسن: أخرجه الطبراني في الكبير برقم: (٧٤٧٣)، وحسّنه الألباني.
(٢) صحيح: أخرجه ابن ماجه برقم: (٢٦٠) وصحّحه الألباني.

## پاداشتی ڕاستگۆیی
## و
## سزای درۆزنـی

**پاداشت:** {**«عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ: يهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ»**}[١]

واته: داواتان لێ دەكەم ڕاستگۆبن، چونكه به تەئكید ڕاستگۆیی ڕێنمایی یە بۆ (هەموو كردارو گوفتارێكی) چاك، وە (كردارو گوفتاری)چاكیش ڕێنمایی (مرۆڤ) دەكات بۆ بەهەشت.

**سـزا:** {**«إِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ: يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ»**}[٢]

واته: داواتان لێدەكەم خۆتان بپارێزن له درۆ كردن، چونكه به دڵنیایی درۆكردن ڕێنمایی یە بۆ (هەموو كردارو گوفتارێكی) خراپو لادان له ڕێی ڕاست، وە خراپەكارییش ڕێنماییه بۆ (چوونە نێو) ئاگر (ی دۆزەخ).

---

١) صحيحٌ: البُخاريُّ برقم: (٥٧٤٣)، ومُسلمٌ برقم: (٦٨٠٥).
٢) صحيحٌ: المصدر نفسه.

## پاداشتی ئەنجامدانی نوێژی هەینی
## و
## سزای وازهێنان لە نوێژی هەینی

**پاداشت:** {**«مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، وَبَكَّرَوَابْتَكَرَ وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا»**}[1]،

واتە: هەر کەسێك (لە ڕۆژی هەینی دا) لەشی خۆی بشواو زۆر زوو بەپێ نەك بە سواری بڕوات بۆ نوێژی هەینی و لە ئیمام نیزیك ببێتەوەو گوێی بۆ بگرێ و لە کاتی وتاردان قسە نەکات ئەوە بە هەموو هەنگاوێکی پاداشتی کردەوەی یەك ساڵی بۆ هەیە، کە تێیدا بە ڕۆژ بەڕۆژووبێ و بە شەو شەو نوێژی تێدا بکات!

**سزا:** {**«مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاثاً مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَهُوَ مُنَافِقٌ»**}[2]

واتە: هەر کەسێك بە بێ پاساو سێ هەینی (لەسەر یەکدی وەك لە فەرموودەی دی هاتوە) نەیەتە مزگەوت (بۆ نوێژ ئەوە سیفەتی) دووڕوویی تێدایە.

---

١) صحيحٌ: أخرجهُ أبو داودَ برقم: (٣٤٥)، وابنُ ماجهْ برقم: (١٠٨٧)، وصَحَّحَهُ الألباني.
٢) حَسنٌ: أخرجهُ إبنُ حبّان برقم: (٢٥٨) قال شُعيب الأرنؤوط: إسْنَادُهُ حَسَنٌ.

# هەندێك لە[١]
# فەرمووده لاوازو هەڵبەستراوەکان

لەبەر زۆری هەڵبەسترانی فەرمووده بەسەر زاری پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پێویستم زانی لێرەدا ئاماژە بە هەندێ فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو بکەم، کە زۆر باون لە نێو خەڵك بە گشتی، بە تایبەتی هەندێکیان لە سەر مینبەرەکان گوێ بیستیان دەبین لەسەر زاری مامۆستایانی ئایینی...

---

[١]) شایانی باسە ئەمە پوختەیەکە لە کتێبی (فەرمووده لاوازو هەڵبەستراوەکان) کە ئێستا خەریکی نووسینین، پێم وایە یەکەم کتێب دەبێ کە بە زمانی شیرینی کوردی لێکۆڵینەوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، بە یارمەتی‌و پشتیوانی خوا لە داهاتوو دەکەوێتە ژێر دەستی خوێنەران.

## دەربارەی ئافرەتان

**{«طَاعَةُ المَرْأَةِ نَدَامَةٌ»} مَوضُوعٌ.[١] ، {«طَاعَةُ النِّسَاءِ نَدَامَةٌ»} بَاطِلٌ.[٢]**

**واتە: گوێڕایەڵی کردنو بە قسەکردنی ئافرەت پەشیمانی لە دوایە.**

**{«شَاوِرُوهُنَّ "يَعْنِي النِّسَاء" وَخَالِفُوهُنَّ»} لاَ أَصْلَ لَهُ.[٣]**

**واتە: پرسو ڕاوێژ بە ئافرەتان بکەن، بەڵام بە گوێیان مەکەنو پێچەوانەی ڕایەکەیان بکەن!!**

**{«يُسَلِّمُ الرِّجَالُ عَلَى النِّسَاءِ، وَلا يُسَلِّمُ النِّسَاءُ عَلَى الرِّجَالَ»} مَوضُوعٌ.[٤]**

**واتە: پیاوان سڵاو لە ئافرەتان دەکەن، بەڵام نابێ ئافرەتان سڵاو لە پیاوان بکەن.**

**{«إنَّ المَرأَةَ إذَا خَرَجَتْ مِنْ بيتِهَا، وَزَوْجُهَا كَارِهٌ لِذَلِكَ لعَنْهَا كُلُّ مَلَكٍ فِي السَّمَاءِ، وَكُل شَيْءٍ مَرّت عَلَيْهِ، غَيْرِ الجِنّ وَالإِنْس، حَتَّى تَرْجِعَ»} ضَعِيفٌ جِداً.[١]**

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ عَدِي فِي (الكامل في ضعفاء الرجال): ج٥، ص٢٦٢، فيهِ عَنْبَسَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَن. قَالَ الأَلْبَانِي: أَوْرَدَهُ العُقَيْلِيُّ فِي تَرْجَمَة عَنْبَسَةَ هَذَا، وَقَالَ: لا يُتَابعُ عَلَيْهِ. وَرُوِي عَن البُخَارِيُّ أَنَّهُ قَالَ فِيهِ: تَرَكُوهُ، قُلْتُ: وَقَالَ أَبو حَاتِم: كَانَ يَضَعُ الحَدِيث.

٢) أَخْرَجَهُ العُقَيْلِي فِي (الضعفاء والمتروكين) ج. ص٧٤، ترجمة: مُحَمَّد بْن سُلَيْمَان بْن أَبِي كَرِيمَة، وَقَالَ: حَدَّثَ عَنْ هِشَام بْن عُرْوَةَ بِبَوَاطِيل لا أَصْلَ لَهَا، وَالقُضَاعِيُّ برقم: (٢٢٦)، وإبْنُ عَسَاكِر (ج ٥٣، ص١٤١)، وَضَعَّفَهُ كُل مِن العَجْلُونِي والشوكاني والألباني، وَقَال المناوي: قَالَ إِبْنُ الجَوْزي: مَوضُوعٌ.

٣) أَخْرَجَهُ إبن طَاهر فِي (تذكرة الموضوعات) رقم: (١٢٨) ، قَالَ الألباني: لاَ أَصْلَ لَهُ.

٤) أَخْرَجَهُ ابْنُ السني فِي (عمل اليوم والليلة رقم: (٢٤٣)، وَابْنُ حبَّان فِي "الضُّعَفَاء" (ج١، ص ١٩٠) من طَرِيق بِشْر بْنُ عَوْنٍ حَدَّثَنَا بَكَّارُ بْنُ تَمِيم، عَنْ مَكْحُول، عَنْ وَاثِلَة بْنِ الأَسْقَعِ مَرْفُوعاً، قَالَ الألباني: أَوْرَدَهُ ابْنُ حِبَّانَ فِي ترجمة بِشْر هَذَا، وَقَالَ: "لَهُ نُسْخَة فِيهَا مِئة حَدِيث، كُلُّهَا مَوْضُوعَة، لاَ يَجُوزُ الإحتجَاج بِهِ بحَال ..، ثُمَّ سَاق لَهُ بِهَذَا الإسْنَاد أَحَادِيث هَذَا أَحَدهَا، وَأَوْرَدَهُ ابْنُ الجَوْزِيّ فِي "الْعِلَلِ الْمُتَنَاهِيَةِ" (ج٢، ص٢٣٤)، وَقَالَ: لا يَصحُّ عَنْ رَسُولِ الله ﷺ، وَقَالَ أَبو حَاتِم الرَّازِي: بِشْر وَبَكَّارُ مَجْهولاَن، لِذَلِكَ قَالَ الأَلْبَانِي: هَذَا حَدِيث مَوضُوعٌ.

واته: هه‌ر ئافره‌تێك له ماڵه‌كه‌ی بچێته ده‌ر، پیاوه‌كه‌شی ئه‌و ده‌رچوونه‌ی پێ ناخۆش بێ، ئه‌وه هه‌موو فریشته‌كانی ئاسمان نه‌فرینی لێ ده‌كه‌ن، وه هه‌ر شتێك كه ئه‌و (ئافره‌ته) به‌لای دا تێپه‌ڕ ده‌بێ نه‌فرینی لێ ده‌كه‌ن جگه له مرۆڤو جن، هه‌تا ده‌گه‌ڕێته‌وه (ماڵه‌كه‌ی).

{«الجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدامِ الأُمَّهاتِ»} مَوضُوعٌ.[٢]

واته: به‌هه‌شت له ژێر پێی دایكانه!

{«خُذُوا شَطْرَ دِينِكُمْ عَنْ هَذِهِ الحُمَيْرَاءِ»} لاَ أَصْلَ لَهُ.[٣]

واته: نیوه‌ی ئاینه‌كه‌تان (یانی: شه‌ریعه‌تی ئیسلام) وه‌ربگرن له‌و سووركه‌ڵه‌یه (واته: عائیشه خوا لێی ڕازی بێ)!

{«أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَوَّجَتْ نَفْسَهَا مِنْ غَيْرِ وَلِيّ فَهِيَ زَانِيَةٌ»} مَوضُوعٌ.[٤]

واته: هه‌ر ئافره‌تێك خۆی ماره بكات (له پیاوێك) بێ مۆڵه‌تی سه‌رپه‌رشتیاره‌كه‌ی (واته: باوك، برا، دایك، مام، خاڵ) ئه‌وه ئافره‌تێكی زیناكه‌ره.

{«لاَ يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيمَا ضَرَبَ امْرَأَتَهُ»} ضَعِيفٌ.[٥]

واته: پیاو پرسیاری لێ ناكرێ له‌به‌ر چی له ئافره‌ته‌كه‌ی داوه!

{«مَنْ زَنَى زُنِيَ بِهِ وَلَوْ بِحِيطَانِ دَارِهِ»} مَوضُوعٌ.[٦]

---

١) أخرجهُ الطبراني في "الأوسط" برقم: (٥١٣د). قال الألباني: ضعيفٌ جدًّا. ثمّ قال لم يروه عن عمرو إلاّ محمّد، تفرّد به سويدُ بنُ عبدِ العزيز قال الذهبي في "الضعفاء": قال أحمد: متروكُ الحديث، وقال في "الميزان" هو واهٍ جدًّا. وقال الهيثميُّ في (المجمع): رواهُ الطبراني في "الأوسط" وفيه سويدُ بنُ عبدِ العزيز وهو متروكٌ.

٢) أخرجهُ الخطيب في (الجامع لأخلاق الراوي) برقم: (١٧٠٢). وضعّفهُ. والقضاعيُّ برقم: (١١٩). والديلمي برقم: (٢٦١١) وقال ابنُ عدي: هذا حديثٌ منكرٌ. قال الألباني: موضوعٌ.

٣) قال ابنُ حجر: لا أعرف لهُ إسنادًا. وقال ابنُ القيّم: كل حديث فيه: يا حميراء، أو ذكر: الحميراء؛ فهو كذبٌ.

٤) أخرجهُ الخطيب في (تاريخ بغداد) ج٣، ص٣١٢، وقال ابنُ الجوزي في "العلل المتناهية": برقم: (١٠٢٤): هذا لا يصحُّ، فيه أبو عصمة إسمهُ نوح بن أبي مريم، قال مسلم والدارقطني: متروكٌ، وقال الحاكم: نوح وضع حديث فضائل القرآن، وكان جامعًا في الخطأ والكذب لا شيء، وقال الألباني: موضوعٌ.

٥) أخرجهُ أبو داود برقم: (٢١٤٩)، والنسائيُّ في الكبرى برقم: (٩١٦٨)، وضعّفهُ أبو الفتح الأزدي والألباني. انظر: ضعيف الجامع الصغير رقم: (٦٢١٨).

واته: هەر کەسێك زینا بکات، زینای لەگەڵ دەکرێتەوە، ئەگەر بە دیواری خانوەکەشی بێ!

**{«تَزَوَّجُوا وَلاَ تطلّقوا فَإِنَّ الطَّلاَقَ يَهتز لَهُ العَرْش»} مَوضُوعٌ.** [٢]

واته: (ژن) بێنن‌و تەڵاقیان مەدەن، بەڕاستی تەڵاقدان (ی ئافرەت) عەرش (ی خوای) بۆ دێتە هەژان!!

**{«أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللهِ الطَّلاَقُ»} ضَعِيفٌ.** [٣]

واته: بوغزێنتراوترین (شتی) حەڵاڵ لای خوا تەڵاقە.

**{«إِذَا قَالَتِ الْمَرْأَةُ لِزَوْجِهَا: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْراً قَطُّ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهَا»} مَوضُوعٌ.** [٤]

واته: ئەگەر ئافرەت گوتیە پیاوەکەی من هەرگیز خێرم لە تۆ نەبینیوە! ئەوە کردەوەکانی (ئەو ژنە) هەموو پووچ دەبنەوەو، (خوا هیچ کردەوەیەکی لێ وەرناگرێ).

**{«إِنَّ اللهَ يَدْعُو النَّاسَ يَوْمَ القِيَامَةِ بِأُمَّهَاتِهِم...»} مَوضُوعٌ.** [٥]

---

١) أَخرَجَهُ الدَّيْلَمِيُّ برقم: (٥٧١٧). قَالَ الأَلبَانِي رَوَاهُ إِبْنُ النَّجَّار بسنده عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ إِبْرَاهِيمِ الْملطِيُّ: أَنبَأَنَا المبَارَك بن عَبْدِ الله المختط: حَدَّثَنَا مَالِك عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ مَرفُوعاً، قَالَ إِبْنُ النَّجَّار: فِيهِ مَنْ لا يُوثَق بِهِ، قُلْتُ: وَهُوَ القَاسم الملطِي كَذَّابٌ، كَذَا فِي "ذيلِ الأحاديث الموضوعة" للسيوطي (ص ١٣٤ )، و"تنزيه الشريعة" لابن عراق (ج١، ص٣١٦). قَالَ المنَاوي: القاسم بن إبراهيم الملطي كَذَّابٌ، قال في اللسان: له عجَائِب مِنَ الأَبَاطِيل، وَالحَدِيث مَوضُوع كَمَا قَالَ الغُمَارِيُّ في المغير (ص ٧).

٢) أَخرَجَهُ الخَطِيب فِي (تاريخ بغداد) ج١٢، ص١٩١. وَقَال إِبْنُ الجَوْزِي: فِيهِ عَمْرُو بْنُ جُمَيْعٍ كَانَ يَروِي الْمَنَاكِير عَنِ المشَاهِير وَالموضُوعَات عَنِ الأَثبات، وَعَامّتها مَنَاكِير، وَكَانَ يُتَّهَمُ بوَضْعها. وَقَالَ إِبْنُ مَعِين: كَذَّابٌ.

٣) أَخرَجَهُ أَبو دَاوُدَ برقم: (٢١٧٨)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٠١٨) وَغَيْرهما، فيهِ عُبَيْدِ الله بْنِ الوليدِ الْوَصَّافِيُّ ضَعَّفَهُ كُل من إبنُ مَعِين والفلاس وَالنَّسَائِيُّ وَالعُقَيْلِي. وَقَالَ إِبْنُ الجوزي: هَذَا حَدِيث لا يَصِحّ، وَضَعَّفَهُ الألباني.

٤) أَخرَجَهُ إِبْنُ عَدِي ج٧، ص١٦٦، وَإِبْنُ عَسَاكِر ج٥٧، ص٨٤. ضَعَّفَهُ البُخَارِيُّ، وَقَالَ الذَّهَبِيُّ: بَاطِلٌ، وَقَالَ أَحْمَد: هَذَا مَوضُوعٌ، هَذَا حَدِيث الكَذَّابِين.

٥) أَخرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير"برقم: (١١٢٤٢)، وَقَالَ الأَلبَانِي: مَوضُوعٌ، قَالَ الهَيْثَمِيّ: فِي سَنَدِهِ إِسْحَاق بْن بِشْر وَهُوَ مَتْرُوكٌ، إِسْحَاق بْن بِشْر الكَاهِلِي كَذَّاب، وَالحَدِيث مَوضُوعٌ كَمَا قَالَ الغُمَارِيّ. قَالَ صَاحِب (تَذْكِرَةُ الموضُوعَات) لَهُ طُرق كُلَها ضِعَاف، وَقَدْ أَوْرَدَهُ ابْنُ الجَوْزِي فِي المَوضُوعَات وَيعَارِضهُ مَا رُوِي بِسَنَدِ

واتە: بێگومان خوا لە ڕۆژی قیامەت (بۆ حیساب) خەڵکی بە ناوی دایکیانەوە بانگ دەکات.

{ «مَن صَبَرَ عَلَى سُوءِ خُلُقِ امرَأَتِهِ، أعطَاهُ الله مِنَ الأَجرِ مثلَ مَا اعطى أيُّوبَ عَلَى بَلائِهِ، وَمَن صَبَرَتَ عَلَى سُوءِ خُلُقِ زَوجِها، أعطَاهَا اللهُ مِثلَ ثَوَابِ آسِيَةَ امرَأَةِ فِرعَونَ» } مَوضُوعٌ.[1]

واتە: هەر (پیاوێك) ئارام بگرێ لەسەر ڕەوشت خراپی ژنەکەی، خوا پاداشتی بە وێنەی پاداشتی (پێغەمبەر) ئەیوب دەداتەوە لەسەر تاقیکردنەوەکەی، وە هەر (ژنێك) ئارام بگرێ لەسەر ڕەوشت خراپی پیاوەکەی، خوا پاداشتی بە وێنەی پاداشتی ئاسیەی خێزانی فیرعەون دەداتەوە.

{ «إِنَّ النِّسَاءَ سُفَهَاءُ، إلاَّ الَّتِي أطَاعَتْ زَوْجَهَا» } ضَعِيفٌ.[2]

واتە: بەڕاستی ئافرەتان گێلو گەمژەن، تەنیا ئەوانەیان نەبێ کە گوێڕایەڵی پیاوەکانیان دەکەن.

{ «إِنَّ النَّظَرَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ إبْلِيسَ مَسْمُومٌ فَمَنْ تَرَكَهُ مِنْ مَخَافَةِ اللهِ أَبْدَلَهُ اللهُ إِيمَانَاً يَجِدُ حَلاوَتَهُ فِي قَلْبِهِ» } ضَعِيفٌ جِدَّاً.[3]

واتە: نەزەر (یانی: تەماشاکردنی ئافرەتان)! تیرێکە لە تیرە ژەهراویەکانی ئیبلیس، هەر کەس لە ترسی خوا وازی لێ بێنێ، خوا بۆی دەگۆڕێ بە ئیمانێك کە لە دڵەوە هەست بە تامو چێژەکەی بکات.

{ «إِذَا جَامَعَ أَحَدُكُمْ زَوْجَتَهُ أَوْ جَارِيَتَهُ فَلاَ يَنْظُرْ إلى فَرْجِهَا..» } مَوضُوعٌ.[1]

---

حبّان" (إنّكُمْ تدعُون يومَ القيامة بأسْمائكُمْ وأسْماء آبائكُمْ فحسّنُوا أسْماءكُمْ)، رَوَاهُ ابْنُ حبّان قال شُعيب الأرنؤوط: رجالُهُ ثقات غير داود بن عمرو وهُو الأودي.

١) أوْردَهُ الغزالي في (الإحياء) ج٢، ص٣٩. وقالَ مخرجه العراقي: لمْ أقفْ لَهُ على أصْل، قال الألباني: فقدْ وجدْتُ لشَطْر الأوّل منْهُ أصْلاً ولكنّهُ موضُوعٌ.

٢) أخْرجَهُ ابْنُ أبي حاتم في (التفسير)، وضعّفَهُ جماعة، منْهُم الذّهبي والحافظ إبْنُ حجَر، والألباني وغيرهم.

٣) أخْرجَهُ الطّبرانيُّ في (الكبير) برقم: (١٠٣٦٢). قالَ الهيْثمي: فيه عَنْ عبْد الرّحْمن بن إسْحاق، قال الألباني: نقل النّووي والزيلعي اتّفاق العُلماء على تضْعيفه.

